# قورئان و
# زانستی نوێ



منتدى إقرأ الثقافي
WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نووسینی: د. مۆریس بۆكای
ئەكادیمیای پزیشكی فەرەنسی

سەلام ناوخۆش
لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕاوە

# قورئان و زانستی نوێ


نووسینی: د. مۆریس بۆكای

ئەكادیمی پزیشكی فەرەنسی


**سەلام ناوخۆش**

ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە و پێشەكی و پەراوێزیشی بۆ

نووسیوە

# پێشەكی:

كاتێك بەوردی لە ڕوداو گۆڕانە سیاسی و عەسكەری و ئابوری و تاقی كردنەوە زانستی‌یەكانی ئەم چەرخە دەكۆڵینەوە، راستی‌یەكی سروشتی دەبێت بە بەشێك لە بیر كردنەوەو تێڕامانمان. ئەو هەموو دیاردانە وامان لێ دەكەن كە ئەم چەرخەپە چەرخی ململانێ ناوزەد بكەین وەك ململانێی دینی، شارستانی، وە ململانێی ئایدیۆلۆژی. لەو نێوەندە، زانست دیدی خۆی هەر هەیە، بەلاّم با بپرسین كام زانست؟! بەر لە هەموو شتێ بازانست و بە ناو تیۆری زانستی لەیەك جیا بكەینەوە، زانست ڕاستی‌یەكی سەلمێندراوە هەرچی تیۆرو گریمانی زانستی‌یە، ئەوا مرۆڤ ناتوانێ بەتەواوی ڕاستی‌یەكانی لەسەر بونیاد بنێ، چونكە لەوانەیە ئەو تیۆرە هەر لە قۆناغێك لە بەرامبەر [illegible] لەو دیاردە راست

دەرچووبێ لە پاشان بەهۆی پێش کەوتنی زانستی، تیۆرەکە لەبن و بۆدکەوە هەڵوەشاوەتەوە.

ئەمەو سیمایەکی تری ئەم چەرخە تێکەڵ بوونی سیاسەتە لەگەڵ تیۆری زانستیدا. دەمێ زانایەك بەگۆیرەی بۆچوونی ماتریالی چەند دیاردەیەکی سروشتیوفیزیکی لێك دەدایەوە، ئەوا لە ئەوروپا هەر زوو ئەو زانایە بە مرۆیەکی ماتریالی و مارکسی و شیوعی ناو زەد دەکرا. دەمێکیش زانایەکی ڕۆژئاوایی لە بواری پزیشکی سۆسیۆلۆژی، یا خود بایۆلۆژی لەڕوانگەی بۆچوونی کەنیساوە لایەنە ئیلحادییەکەی تیۆری مەتریالیزمی پوچەڵ دەکردەوە، ئەوا سۆڤیەتییەکان و لایەنگرانیان هەزار ناوو ناتۆرەی ئایدیالستیو سەرمایەداری وکۆنەپەرستییان لەو زانایە دەنا. ئەوە لە ئەوروپا و ڕۆژئاوا بەگشتی، کەچی لەلای ئێمە، بەتایبەتی لەنێو ئێمەی کورد، ئەوا مەسەلەکە لە ئاڵۆز، ئاڵۆز تر بوو. چونکە لەسەردەمی بەهەرمێنی بۆچوونی مارکسیدا،

زانست تـەنیا ئـەو تیۆرانـە بـوون، کەماوەیـەکی زۆر لـە ڕۆژئاوا هەڵوەشێنرابوونەوە. هەرچی مەسەلەی سیاسەت و دینیش بوو ئەوا هەریەکە لەخانەیکی دژ بەیەك دانرابـوون، سیاسـەت هـەرچی هـەبوو نـەبوو، تیـۆری مارکسـی بـوو هەرچی دینیش بوو ئەوا تەنها لەچەند پەرستنێکی تـەقلید و ڕووتـی نێـو مزگـەوت زێـتر، چیتـر نـەبوو چونکـە وافـێر کرابووین، کەدینی ئێمـە بەکـەڵکی ژیـان نایـەت هـەر بۆیـە دەبێ دەستور لە مۆسکۆ یان واشـنتن وەربگریـن. ڕەوتـی ڕووداوەکان تـاکو هەڵوەشـاندنەوەی یۆتۆبیـای شـیوعیەت هەر ئەو دەقەی وەرگـرت بـوو، بـەڵام دوای ئـەو هەرەسـە ئەبەدییە، ئەو بوژاندنەوە دینییەی ئەوروپای گـرت بـۆوە ڕۆناکی بەرەو کوردستانیش هات!

بـەڵێ ڕابوونـی ئیسـلامی زۆربـەی وڵاتـانی ئـەوروپای گرتۆتەوە بەتایبەتی هـەردوو وڵاتـی فەرەنسـاو بـەریتانیا، لەو نێوەندەش چـەندەها زانـای بلیمـەت لـەنێو تەلیسـمی کەنیسا خۆیان ڕزگار کرد و ژیرانە بـە خـودی خۆیـان وەك

مرۆڤ و بونەوەر داچوونەوەو بە ڕێبازێکی زانستیانە لە ئیسلام نزیك بوونەوە. ئەو لە ئیسلام نزیك بوونەوەیە کاریگەرێکی ئیجابی زۆری لەسەر زانستی نوێ دروست کرد هەروەها لەلایەکی تر ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زانستی نوێ موعجیزەی‌نەدۆزراوی قورئانی پیرۆزمان بۆ دەخاتەڕوو. بەواتای خۆ ڕزگارکردن لە تیۆرو گریمانی پووچ و گرنگی‌دانی تەواو بە زانستی نوێ سودێکی دینی و حەزاری(ژیاری) و زانستی و مرۆڤایەتی هەیە، چونکە چەند موعجیزەیەکی تازەی قورئان بەدەرکەوێ دەبێتە هۆی موسڵمان بوونی زانای تر. ئا لێرەدا پێویستە ئاماژە بەگرنگی ڕۆڵی عەقڵ و زانایان بکەین لە ئیسلامدا. خوای گەورە لە چەندان ئایەت دەفەرموێ ﴿لعلكم تعقلون، ...تتفكرون،... تتذكرون،...﴾ هەروەها ڕاست دەفەرموێ:﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ﴾ فاطر: ٢٨ هەروەها دەفەرموێ ﴿يرفع الله الذين آمنوا منكم والذين أوتوا العلم درجات والله بما تعملون خبير﴾

المجادلـــة:١١ هــەروەها پێغەمبەریـــش- ﷺ - لـە بـارەی عەقڵەوە دەفەرموێ: ((خوا هیچ شتێکی لە عەقلْ باشــتری بـۆ مــرۆڤ دروســت نــەکردووە)). هــەروەها دەربــارەی زانایانیش بەسە کەبفەرموێ ((العلماء ورثة الأنبيـــاء)) ئـەو راستییە زانستیانەی نێو قورئــان، ئــەمڕۆ وا لــە زانــای سـەردەمی کۆمپیوتـەرو ئەنتـەرنێت دەکـەن بـە راشـکاوی ڕابگەیـەنن: کـە ئــەو ئایاتانــەی لــەقورئان دا دەربــارەی هەندێ بابەتی زانستی هاتوون دەقـاودەق لەگـەلْ زانسـتی نــوێ تێــك دەکەنــەوە. هــەرچی بیروبــاوەڕی ماتریــالی‌و کەنیسایی هەیـە ئـەوا لـە تـەرازووی زانسـتی نـوێ دا هیـچ کێشێکیان نییە.

سەبارەت بەناوەڕۆکی ئـەم نامیلکەیـە هیـچ نـالێم، تـۆ خۆت بەوردی بیخوێنەوە و بەوردی لەگەلْ ئاستی زانیــاری خۆت بەراووردی بکە ئەوسا دەزانی خـۆت وەك موسـلْمانێك لـەکوێی و خـەلْك لـە ڕۆژئـاواش چـۆن لــە دینەکــەی تــۆ دەگەن؟!

ئەو نامیلکەیەم لـە سـالّی ١٩٩٢ لـە ئینگلیزیـیـەوە بـۆ کـوردی وەرگـــێڕاوە. لەهـــەر شـــوێنێك کەنـــەمتوانی‌بێ وەرگێڕانەکـــە دەقـــاو دەق بێنـــم ئـــەوا هـــەوڵم داوە، تەرجومەیەکی تەفسیری دیاردەکە بکەم.

**سەلام**

**١٩٩٣/٣/٦ز**

# بسم الله الرحمن الرحيم

## دەروازەیەك:

د. مۆریس بۆكـای لـە بـواری نوژداریـدا نوژدارێكـی كارامەو لێـهاتووە، لـە بـواری زانسـت و پـەیوەندی دیـن و زانستیشدا، بۆكـای رۆشـنبیرو زانایـەكی لێـهاتووە. ئـەو نـوژدارو زانـاو رۆشـنبیرە، نوسـەری كتێبـی "ئینجیـل و قورئان و زانست"ە(١).

بۆكای لەو كتێبەیدا توێژینەوەیەكی زانستی لە بـارەی سروشـی یـەزدانی تـەورات و ئینجیـل و قورئـان پێشـكەش دەكات.

لە راسـتیدا ئـەو كتێبـەی بۆكـای بەشـدارییەكی بـێ وێنەیە لە بواری دین و زانستدا.

ئەو توانـا زانسـتییەی بۆكـای وای لـە ئـەكادیمیای فەرەنسـی كـرد، كـە بۆكـای هـەڵبژێرێ بـۆ ئـەوەی دیراسـەیەكی زانسـتی لەسـەر جەسـتەی مۆمیـاكراوی

میرناپتای فیرعەونی میسر بکات، بۆکـای ئـەو دیراسـەیەی ئەنجامدا(هەر ئەو دیراسەیەش وای لێکرد کە بەراوردێك لـە نێوان قورئان و ئینجیل لە بارەی ئەو فیرعەونە بکات).

کـاتێك بۆکـای بـەرەو سـعودیە دەچـێ، لـەوێ چـەند ئایەتێکی قورئـانی لـە بـارەی جەستەی فیرعەونـەوە پـێ پیشان دەدەن.

خوای گـەورە لـەو چـەند ئایەتـەدا دەفـەرموێ کـە جەستەی مردووی فیرعەون دەپارێزێ هەروەك نیشـانەیەك لە سەر مەزنێتی خۆی بۆ نەوەی داهـاتووی مـرۆڤ(٢). د. بۆکـای وەك زانایـەکی راسـت ویسـت لـەو مەسـەلەیە دەکۆڵێتـەوە بـەحوکمی ئـەوەی بۆکـای مەسـیحی بـووە شـارەزایی لـە بـارەی خنکـانی ئـەو فیرعەونـە هـەبووە کەویستوویەتی موسا پێغەمبەر بگرێ لە پاشـان لـە دەریـا خنکاوە.

ئەوەی شایەنی بـاس بـێ، قورئـان بەراشـکاوی باسـی ئەو بەسەرهاتە دەکـا. ئـەو راستـیەیە شاراوەشـی، کـە بـۆ

زانایەکی رۆژئاوایی وەك بۆکای دەردەکەوێ سەرسام دەبێ بەوەی کە چۆن تاکو کۆتایی ئەو چەرخە، ئەو حەقیقەتە نەزانراوە کە قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا پێش بینی کردووە کە خوای گەورە لاشەی مردووی فیرعەونی سەردەمی موسا پێغەمبەر(درووود و سلاّوی خوای گەورەی لێ بێت) دەپارێزێ. پاش ئەوەی بۆکای فێری زمانی عەرەبی دەبێ و ئەو حەقیقەتە نوێیە وا لە بۆکای دەکات کە دیراسەیەکی قوولی قورئان بکات، پاش توێژینەوەیەکی زۆر بۆکای ئاکامی توێژینەوە بەراوردییەکەی لەسەر قورئان و ئینجیل بەو شێوەیە رادەگەیەنێ: ئەو بە یانانەی دەربارەی دیاردەی زانستی لە قورئاندا هاتوون هەمووی بە تەواوی لەگەل زانستی نوێ دەسازێن هەرچی چیرۆکەکانی نێو ئینجیلیشن(٣) دەربارەی هەمان بابەت، ئەوا لە نەزەری زانستەوە مەقبوول نین!.

ئەو نامیلکەی بەردەستیشت موحازەرەیەکی د. بۆکایە لە پەیمانگای کۆمن ویلسن لە لەندەن لە بارەی

قورئان و زانستی نویێ پێشکەشی کردووە، هیواداریـن ئـەو نامیلکەیـە رێ نوێنیـت سـەبارەت بـە حەقیقــەتی ئــەمری ئیسلام پێ ببەخشێت.

**مەڵبەندی**

**راگەیاندنی ئیسلامی**

**بەریتانیا/بیر مەنگەهام**

# قورئان و
# زانستی نوێ

له ١٩٧٦/١١/٩، له ئـهكاديمياى پزيشـكى فهرهنسى، موحازهرهيـــهكى تـــازهم بـــهناوى " ئهندامناســـى و كۆرپهلهزانى له قورئاندا" پێشـكهش كـرد، راسـتىيهك كـه هـانى دام ئهمموحازهرهيه لـهو بارهيـه پێشــكهش بكـهم ئهوهبوو:

چۆن دهبـــێ لــــه چـــهرخى هاتنــــه خـــوارهوهى قورئاندا(٦١١-٦٢٤) دهقێك ههبووبێ و ئهو هــهموو فكـره زانستيانهى له خۆگرتبێ كه تهنيا تازه بهتازه له چـهرخى نـوێدا بـههۆى دهزگـاى زانســتى نـوێوه، ئــهو فكرانــه دۆزراونهتـــهوه؟! چونكـــه لـــه راســتى دا هيـــچ كـــارێكى مرۆڤكرده نىيه كه له پێش چهرخهكانى نوێ هات بێونهو

هـەموو بەیانـە زانسـتیيانە لـەخۆبگرێ، بەشـێوازێکی تــر، نەزانراوە کە لە پێش سەردەمی قورئـاندا هیـچ بیرۆچکـەی زانستی ورد هەبووبێ و ئەوە بێنێ لەگەڵ قورئــان بـەراورد بکرێ، ئەو دیـاردە ناوازانـە، پاڵنــەری سـەرەکی بـوون بـۆ ئەوەی بەراوردێك لە نێوان کتێبە ئاسمانیيەکان: تەورات و ئینجیل و قورئان و زانستی نوێ بکەم. ئاکامی ئەو پـرۆژە بەراوردکاریەشم، کتێبی "ئینجیـل و قورئـان و زانسـت" ی لێ کەوتەوە. یەکەم چاپی فەرەنسی ئەم کتێبەم لە ئایاری ١٩٧٦ بلاو بۆوە. چاپی ئینگلیزی و عەرەبیشی لەو زووانە بلاوکراونەتـەوە. ئـەو نوسـینە وەك دیاردەیـەکی ئاســایی خۆی راپێش کرد بۆ ئەوەی حەقیقـەتی پـەیوەندی دیـن و زانستی نوێ لە روانگەی ئیسلامەوە روون بکاتەوە کـە لـە نەزەری ئیسلام هەمیشــە دیـن و زانسـت بـە دوو خوشـکی جمك دادەنرێن.

ئەمەو لەکاتێکدا ئەمرۆ کە زانست گەیشـتۆتە پۆپکـەی مەزنێتی، هیچ هاودژیيەك لە نێوان دین و زانست دروسـت

نابێ بەلکو هەردووکیان لـە هاوئاهەنگی‌یـەکی تـەواو دان و بەردەوام زێتر دەچرژێنە نێو یەکتر و ئاوێتەی یەکتر دەبن. بە دەرك کردن بەو پەیوەندی‌یە سروشتی‌یەدا، ئەمرۆکە وا چـەندان بابـەتی بەڵگـە نەویسـتی زانسـتی وەك هۆکـارێك بەکاردێن بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ بە شێوەیەکی ئاسان تر و باشتر لە دەقەکانی قورئانی پیرۆز بگات.

لە سەردەمێکدا بۆماوەیەکی دوورو درێژ راستی‌یەکانی وەك چەکێکی کوشندە لـە دژی بـاوەری دینی‌یـەوە بـەکار دەهێنران، بەلام ئەمرۆ بەوردی دۆزینـەوەکانی زانسـتی لـە رێگای تاقی کردنەوەیەکی بابەتیانەی سروشی خوایی‌یەوە بوونەتە هۆی زێتر بەرزکردنـەوەو گرنگـی پێدانـی هێمـای بابەتی میتافیزیقیای چەند لایـەنێکی وەحـی ئیلاهی‌یـەوە. لە چوارچێوەیەکی گشتی‌یەوە بدوێین زانیاری زانستی بـێ گـوێ دانـە ئـەوەی خـەلك دەیلـێ، وا خـۆی دەردەخـا کـە یارمـەتی دەرێکـی بـەهێزە بـۆ رەنگدانـەوەی حەقیقـەتی سـەلماندنی بوونـی خـوای گـەورە. کـاتێك لەگـەل خـودی

خۆمان بەگژ فکران رادەچین و بەشێوەیەکی پاك و بێمەبەست پرسیار لە خۆمان دەکەین دەربارەی وانەکانی میتافیزیکییەوە—ئەو دیوی سروشت، کە کرۆکی پرسیار کردنەکانیشمان لە هەندێ زانیاری رۆژانە سەرچاوەی گرتبێ وەك: ئاستی زانیاریمان سەبارەت بە بچووکترین شت لەو بونەوەرەدا، یاخود تێروانینمان دەربارەی کێشەی ژیان، لەو نێوەندەدا بۆ دۆزینەوەی وەلامی دروست چەندەها هۆ دەدۆزینەوە بۆ ئەوەی پەوتی تێفکرین و بیرکردنەوەمان بەرەو ئەو راستییە ببەین کە ئەو نیزامە وردەی بونەوەر بێ خولقێنەر نییە، بەواتای کاتێك مرۆڤ بە قووڵی لە نیزامێکی دیار ورد دەبێتەوە، کە پرۆسەی " لەدایك بوون" و بەردەوامی ژیان بەرێوە دەبات، بەرە بەرە بەرەو ئەو دڵنیاییە سروشتییەدەچێت کە ئەو شیمانانە رەد بکاتەوە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو نیزامانە ئاکامی دەستی "رێکەوت" بن! بە شێوازێکی تر، قەبوول کردن و

رەدكردنەوەی ئەو شیمانانە پابەندە بە رادەی زانیاری دروستی و وردبوونەوەی دروستی مرۆڤەوە چونکە هەرکاتێك ئاسۆی زانیاری و پێشکەوتنمان لەو بوارەدا فراوانتر بێت، ئەوا ئەو شیمانانەی پرۆسەی لە دایك بوون و بەردەوامی ژیان بەدەست کردی " رێکەوت" دادەنێت کەمتر دەبن و لە دوایی دا نامێنن.

ڕۆژانە هەندێ چەمکی فکری- نامەقبوول لەڕووی زانستییەوە- لێرەولەوێ دەوروژێنرێن وەك ئەو ڕایەی کە برەوەی خەلاَتی نۆبل لەبواری پزیشکی بۆ وەرگرتنی خەلاَتەکە پێش کەشی کرد.

خەلاَت وەرگری فەرەنسیکۆششی دەکرد بۆ ئەوەی بۆ خەڵك بسەلمێنێ کە ماددەی زیندوو لەخۆوە دروست دەبێت. ئەو پرۆسەی ئافراندنەش لە ئاکامی چەند هەڵ و مەرجێکی ڕێکەوتی پەیدا دەبێت. کورتەی تاقی کردنەوەش بەمجۆرە بوو:

لەژێر کاریگەری چەند هۆکارێکی دەرەکیەوە، چەند ڕەگەزێکی کیمیایی سادەی مادده زیندووەکان وەك بنەچەیەك بەکاردەهێنرێن و بەو جۆرە پرۆسەی دروست بوون ڕوودەدات! لەمەوە بانگاشەی ئەوە دەکرێ، کە ئەندامە زیندووەکان بەو جۆرە دروست دەبن و لەپاشان ئەو هەموو ئەندامانە بەرەو ئالۆزیەکی دیار دەچن و ئەوەی پێی دەوترێت " مرۆڤ " دروست دەبێت!

هەرچی دیدی منە سەبارەت بەئافراندنی بوونەوەرو مرۆڤ، ئەوا دیدێکی زانستیانەیە بۆ جەوهەری مەسەلەکان نەك پابەند بوون بە چەند هەل و مەرجێکی دەستکردی ڕێکەوت، لەدیدی من دەتوانین پێش کەوتنی زانستی وەك هۆکارێك بەکاربێنین بۆ ئەوەی لەو ڕێگایەوە زیاترو ڕوونتر لە ئالۆزی و فانتازی بونەوەر بگەین بەواتای بوونی نیزامێکی کارامەی نائاسایی، کە چاودێری ڕێکخستنێکی دیاری دیاردەکانی ژیان دەکات، هەقیقەتی حەتمیە و ناتوانرێت نکوولی لێ بکرێت، ئەو تێروانینەش

گفت و گۆیەکی توند لە دژی بەرژەوەندی بیردۆزی ڕێکەوت بەرپادەکات، لە زۆربەی بەشەکانی کتێبەکەمدا(ئینجیل و قورئان و زانست) ئەوەم ڕوون کردۆتەوە کە قورئان بەشێوازێکی سادەوە ئەو ڕەنگدانەوە گشتی‌یانەمان لە بارەی بوونەوەرو مرۆڤ بۆ دەخاتە ڕوو، لەمەش زیاتر قورئان بابەتی بەڵگە نەویستی هێندە وردی لە خۆگرتووە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەو ڕاستی‌یە زانستی‌یانەوە هەیە کە تازە زانستی نوێ دۆزیویەتەوە، ئەو ڕاستیانەش جێگەی ڕاهێنانی سەرنجی موگناتیسین بۆ زانایانی ئەمڕۆ!

## بۆ ئەوەی لە قورئان بگەین پێویستیمان بە زانیاری‌یەکی هەمەلایەنەیە :

بۆ ماوەی چەندان سەدە مرۆڤ بە بەردەم ڕاستی‌یەکان دەستەوەستان بوو ونەیدەتوانی لەو

راستی‌یانە بکۆڵێتەوە، چونکە ئەوسا هۆکارێکی زانستی هێندەی بەدەستەوە نەبووە کە بتوانی بەو کارە هەڵبستێ، ئەوە تەنیا ئەمڕۆکەیە لە چەرخی زانستی نوێ بەرەبەرە دەردەکەوێ کە چەندەها ئایەتی قورئانی پیرۆز لە دیاردەکانی سروشت دەکۆڵنەوە و هەروەها بوونەتە چەمکێك بەتەواوی فام بکرێن، لێرەدا پێویستە بە راشکاوی بلێم کە لە چەرخی بیستەمیشدا کە زانست گەیشتۆتە پۆپکەی مەزنێتی، هەموو کات زانایەکی ئاسایی ناتوانێ هەرچی لە قورئاندا دەیخوێنێتەوە دەربارەی هەندێك بابەت بەبێ ئیستیعانە کردن بە توێژینەوەی تایبەتمەندێتی‌یەوە بە سووك و ئاسانی لەو بابەتانەی قورئان بگات، پوختەی قسان ئەوەیە بۆ تێگەیشتنێکی دروستی ئەو هەموو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز مرۆڤ پێویستی بە دابین کردنی زانیاریەکی هەمەلایەنەی گشتگیری هەیە، مەبەستی من لەمەوسوعەی زانیاری ئەو مەوسوعەیە کە زۆربەی یاساکان لە خۆ دەگرێت.

من خۆم زاراوەی "زانست" بەو واتایە بەکاردێنم کە راست و دروست دامەزرابێت. ئەو زانستەی من گەرەکمە لەبارەیەوە بدوێم ئەو بیردۆزو تیۆرانە ناگرێتەوە خۆی کە بۆ ماوەیەك هۆکارێکی یارمەتیدەر دەبن بۆ شیکردنەوەو شرۆڤەکردنی چەند دیاردەیەك یاخود زنجیرە دیاردەیەك لە پاشان هەڵدەوەشێنەوە. لێرەدا دەمەوێ بڵێم هەر خودی راستی‌یە زانستی‌یە سەلمێندراوەکانە کە ئەو تیۆرانە هەڵدەوەشێننەوە بە شێوەیەکی بنەڕەتی من دەمەوێ تەنیا لایەنە لەیەك چووەکانی بەیانەکانی قورئان و زانستی نوێ دیراسە بکەم، دوبارە دەمەوێ بڵێم کە ئەو زانستەی من دەمەوێ سەلماوەو چی‌تر ئەوە هەڵناگرێ گفتوگۆی زیاتری لە سەر بکەی، جا بۆیە لە هەرشوێنێك کە راستی‌یە زانستی‌یەکان، کە هێشتا ١٠٠٪ دانەمەزراون، دەخەمە ڕوو بە دڵنیایی ئەو خالانە ڕوون دەکەمەوە لەمەش زیاتر، دەبێ ئەوەش بڵێم کە هەندێ بەیانی دەگمەن لە قورئاندا هەن، تاکو ئێستاش زانستی نوێ

نەیتوانیوە ئیسپاتیان بكات، بەلآم لە نەزەری زانایان ڕوودانی ئەو هەقیقەتە شاراوانە شتێكی نزیكە لە داهاتوودا: نموونەیەك بۆ ئەمەئەو بەیانەی قورئانە كە دەفەرموێت: " ئاو سەرچاوەی ژیانە" یان "ژیان لە ئاوەوە سەرچاوەی گرتووە" نموونەی دی وەك "لە شوێنێكی بونەوەر، زەوی یەكی دی وەك هی ئێمە هەیە".

لەگەل ئەوەشدا نابێ ئەو بۆچوونە زانستیيانە وامان لێبكەن، ئەو ڕاستیيە لەبیر بكەین كەقورئان كتێبێكی دینیيە، نەك كتێبێكی زانستی ڕووت. خاڵێكی دی ئەوەیە بێگومان نابێ چاوەڕێ بكەین كە قورئان تەنیا مەبەستێكی زانستی سەد لە سەدی هەبێ. هەركاتێ مرۆڤ ویستی لە پرۆسەكانی دروست بوون و دیاردە سروشتیيە بێكۆتاییيەكان ورد بێتەوە، بەشێوەیەكی سروشتی مەیلی بۆ ئەوەدەچێ كە دووپاتی قودرەتی خوای گەورە بكاتەوە. ئێمە لەنێو ئەو هەموو سەلماندنانەدا دەتوانین هێمایەكی ناڕاستەوخۆ بدۆزینەوە بۆ ئەو بەلگەنەویستانەی

لەگەڵ زانیاری زانستی نویٚ یەك دەگرنەوە. ئەوەش
بیٚگومان بەهرەیەكی دی خوای گەورەیە بۆ مرۆڤ كە
دەبیٚ ڕۆناكی دینەكەی لەچەرخیٚكدا بگەشیٚتەوە كە
زانستیانە بنەچەی داڕیٚژراوەو ئیلحادی ماددی یەت دەیەویٚ
لەسەر حسیٚبی باوەڕ بەخوا نەبوون دەستی
بەسەردابگریٚ. لەسەراپای لیٚكۆلینەوەكەمدا هەمیشە
هەولّم داوە كە بابەتی بم. لەو بارەوە، لەو باوەڕەدام
كەسەركەوتنم بەدەست هیٚناوە هەروەك چۆن ئەو
دكتۆرەی بابەتی یانە فایلی نەخۆشەكەی دەكاتەوە بۆ
ئەوەی بگاتە ئەو حالّەتەی كەبتوانیٚ جۆری نەخۆشی یەكە
دیاری بكات. لیٚرەدا پیٚویستە ئەوە بدركیٚنم كەلەسەرەتا،
باوەڕ بەئیسلام نەبوو ڕیٚبەری هەنگاوەكانمی دەكرد،
بەلّكو تەنیاگەڕانیٚكی سادە بەدوای ڕاستی بوو. بەلیٚ
بەشیٚوەیەكی سەرەكی هەر " ڕاستی " بوو، ئەو
ڕاستی یەی كەهەر ئەو ساتەی لەلیٚكۆلّینەوەكەم بوومەوە
بەرەو ئەوەی بردم كەئەوەی من بەلیٚكۆلّینەوە

گەیشتومەتیّ، لەقورئاندا بەشێوەیەکی وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتووە. ئێمە کە لەو بەیانە زانستی ئامێزانەی قورئان ورد دەبینەوە کەتازە بۆمرۆڤ ڕاستی‌یە زانستی‌یەکان بەدەرکەوتوون تەنیا بۆ ئەوەی نی‌یە کە ڕاستی زانستی تۆماربکەین، بەڵکو ئەوەش ڕوون دەکەینەوە کە مرۆڤی چاخەکانی پێشوو تەنیا لەواتا ئاشکراکانی ئەو دەقانە گەیشتوون. لەوانەیە، هەندێ وازەن ببەن کەچۆن ئەو دەقە شاراوانەی نێو قورئان لەژێر کارامەیی دەستی مرۆڤ ڕزگاریان بووە؟ بەواتای چۆن دەسکاری نەکراون؟ دەزانیت بۆ هیچ شتێکی ئاوا نەکراوە، چونکە بچووکترین گۆڕانکاری لە دەقەکاندا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەو یەکگرتنە توندوتۆڵەی، کەسیمای دەقەکانی قورئانە، تێک دەچوون((٤)) . لەلایەکی دیش، ئەگەر هەر دەسکاری‌یەك بکریّ ئێمەی زاناش ناتوانین بەڕاشکاوی هاو ئاهەنگی ئایەتەکان و زانستی نویّ بپارێزین. بەیانەکانی قورئان زۆر بەڕێك

وپێکی چەسپ کراون دەقاودەق لەچاودێرێکی پاك دەچێ، ئەمەش ڕەسەنێتی قورئان دەردەخات. قورئان کتێبێکی ڕێنوێنییە مرۆڤ لەڕێگای وەحییەوە، کەنزیکەی بیست ساڵیخایاند، پێی ئاشنابووە.((٥))ئەو وەحییەش دووماوەی درێژی پێش کۆچ کردن وپاش کۆچ کردنی خایاندووە. ئەمەش وای کردووە کە لایەنی زانستی لەنێو سەراپای قورئاندا ڕەنگ بداتەوە. لەباری دیراسەکردنێکی وەك ئەوەی ئێمە پێی هەڵساوین پێویستە دەقە قورئانییەکان دووبارە بە گوێرەی بابەت سوڕەت دوای سوڕەت پۆلین بکەین، کەوابێ چۆن دەقەکان دابەش بکەین؟! من نەمتوانی هیچ ئاماژەیەك لە قورئان بدۆزمەوە پێشنیاری پۆلین کردنێکی تایبەتی بکات،هەر بۆیە بڕیارم دا دەقەکان بەگوێرەی پۆلینی خۆم پێش کەش بکەم لەپۆلینەکەمدا بۆم دەرکەوت کەیەکەم بابەت لێیبکۆڵمەوە بابەتی " دروست بوون " بێت. لێرەدا بەپێویستم زانی کەبەراوردێك سازبدەم لەنێوان ئەو

ئایاتانەی ئاماژە بۆ مەسەلەی لەدایك بوون دەكەن لەگەڵ ئەو فیكرە گشتییە زانستیانەی ئەمڕۆ لەسەر دروست بوونی بوونەوەردا هەن. لەپاشان ئایەتەكانم لەژێر ئەو ناونیشانانەی خوارەوە دابەش كردووە: ئەستێرەناسی، زەوی، جیهانی گیانەوەرو ڕووەك، مرۆڤ ودروست بوونی مرۆڤ بەشێوەیەكی تایبەتی. ئەوەی شایانی باس بێ ئەو بابەتەی دواوە شوێنێكی زۆر گرنكی لە قورئان دا بۆ تەرخان كراوە. بۆئەو هەموو ناونیشانە سەرەكیانە، دەشێ ناونیشانی لاوەكیش زیاد بكرێن، سەرەڕای ئەمانەش بەشتێكی سوودبەحشم زانیوە كە لەڕوانگەی زانستی نوێوە بەراوردێك لەنێوان چیرۆكەكانی قورئان و ئینجیل لەبارەی بابەتی وەك دروست بوون و تۆفانەكەی نووح وكۆچڕەو ئەنجامبدەم.

# بابەتی یەکەم:

# دروست بوونی بونەوەر

باجارێك بەدیقەتەوە لەدروست بوونی بوونەوەر وردببینەوە هەر وەك چۆن لەقورئان وێنەی کێشراوە. لەو وردبونەوەدا فکرەیەکی گەلێك گرینگمان بۆ دەردەکەوێ ئەویش خاڵی لەیەك نەچووی قورئانە لەگەڵ ئینجیل. قورئان ئەو فکرە گشتییە باوەی ڕۆژئاوا ڕەت دەکاتەوە کە نوسەرانی ڕۆژئاوا، بۆ کەم کردنەوە لە بەهای قورئان لەهەموو ڕوویێکەوە، بەئەنقەست جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە قورئان وئینجیل وەك یەکن.کاتێك دەربارەی دروست بوون و بابەتەکانی تریش، دەدوێین ڕۆژئاواییەکان بەتوندی بانگاشەی ئەوە دەکەن کە محمد ﷺهیچی پێنەبووە تەنیا شێوازە گشتییەکەی ئینجیلی کۆپی کردۆتەوە. بۆ ئەوەی ئەو گومانە ڕەدبکەینەوەو با

بەراوردێك لەنێوان ئەو شەش ڕۆژەی دروست بوونی بونەوەرو ئەو ڕۆژە زیادەی حەسانەوەی خوابکەین هەروەك لە ئینجیل هاتووە، لەگەڵ ئەو ئایەتەی سورەتی الأعراف: ﴿إن ربكم الله الذي خلق السماوات والأرض في ستة أيام﴾ الأعراف: ٥٤ "پەروەردگاریئێوە -اللَّهُ- یە کەئاسمانەکان و زەوی لەشەش ڕۆژدا دروست کردووە"((٦)) پێویستە هەرزوو ئەوە ڕوون بکەینەوە کەتوێژینەوە نوێیەکان جەخت لەسەر لێکدانەوی زاراوەی - أيّام - دەکەن. ((٧))هەندێك زاراوی"أيّام" بە "ماوە درێژەکان" یاخود "چەرخەکان" تێدەگەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە "أيام" بەواتای ماوەی ٢٤کاتژمێری ئاسایی زیاتر بێت. ئەوەی من لە لێکۆڵینەوەکەمدا بۆم ساغ بۆوە-کەخۆی لەخۆیدا گرینگیەکی بنەڕەتی هەیە- تەواو بەپێچەوانەی ئینجیل، قورئان جەخت لەسەر زنجیرە زەمەنی دروست بوونی زەوی و ئاسمانەکان ناکات، بۆیە دەمێك قورئان بەشێوەیەکی گشتی لەبارەی "دروست بوونەوە" دەدوێت ئاماژە بۆ هەردوولا دەکات: جارێك

ئامـاژه بـۆ ئاسمانـەكان پێش زەوی دەكـات و جـارێكی‌تر پێشتر ئامـاژه بۆ زەوی دەكات((٨))،ئەو ڕاستی‌یەش لـەو ئایەتەی سورەتی طه هاتووه: ﴿تنـــزيلا ممن خلـــق الأرض والسماوات العلى﴾ طـــه:(٤). " سروش لەخواوەیە كـە زەوی‌وئاسمانـە بـەرزەكانی ئـافراندووه" لەڕاستی‌دا، ئـەو فیكـره گشـتی‌یەی لـەبارەی ئاسمـان و زەوی لـەقورئان دا هاتووه لەیەك نزیك بوونەوەی پێش كەوتن و پەرەسەندنی ئاسمانی‌و زەمینی دەگەیەنێ. هەقیقەتێكی ڕەهای تـر كـە لە قورئان دا هاتووه دەڵێ بونەوەر لەسـەرەتا كوتلەیـەكی گازی–دووكەڵ–ی بێ‌وێنە بووه:

ڕەگەزەكانی لەبەرایی‌دا تێك چـرژاون ولەپاشـان لەیـەك جودابوونەتـــەوه. ئـــەوفكره گشـــتی‌یە دەربـــارەی ئەوڕاستی‌یەی قورئان و زانسـتی نـوێ لـە سـوڕەتی‌فصّلت ئایەتی((١١)) تەعبیری لێكراوه: ﴿ثم استوى إلى الســـماء وهي دخـــان﴾ ((خـودا ڕووی كـرده ئاسمـان، لـە كـاتێكدا ئاسمان دوكەڵ بـوو))، هـەمان فكـره لەسـورەتی الأنبيـــاء

ئایەتی(٣٠) هاتووە:﴿أولم یری الذین کفروا أن السماوات والأرض کانتا رتقا ففتقناهما وجعلنا من الماء کل شيء حي أفلا یؤمنون﴾ الأنبیاء:(٣٠) ((ئایا بێباوەڕان نابینن کە ئاسمانەکان و زەوی لەنێو یەك بوون لەپاشان لەیەکمان جوداکردنەوە)). ئەو پرۆسەی لەیەك جودا بوونەوەی ئاسمانەکان و زەوی بوو بەهۆی دروست کردنی دووجیهان. ئەو بۆچوونەش دوازدە جار لەقورئان دا هاتووە. یەکەم جار یەکەم ئایەتی سورەتی الفاتحە ی پێکهێناوە:﴿الحمدلله رب العلمین﴾، ((سوپاس بۆخودای پەروەردگاری هەردوو جیهان))((٩))ئەو هەموو ئایەتە قورئانی‌یە هیچ ناکۆکی‌یەك لەگەڵ بیروبۆچوونی زانستی نویَ پێك ناهێننن بەڵکو زانستی نوێش ئەو ڕاستی‌یەی قورئان دووپات دەکاتەوە کەپێشتر تەمێك هەبووە، لەپاشان پرۆسەی لەیەك جیابوونەوەی ڕەگەزەکان ڕووی داوە.((١٠)) ئەو تەقینەوەیە(لەیەك جودا بوونەوەی ئاسمان و زەوی) بوو بەهۆی دروست بوونی

گالاکسی(کەوکەبەکان)، لەپاشان کەئەمانەش دابەش کران، ئەستێرەکان پەیدابوون، لەوانیش ئەجرامە ئاسمانی‌یەکان پەیدا بوون. سەرەڕای ئەوەی کە قورئان باس لە دروست بوونی هەردوو جیهانی ئاسمانەکان و زەوی دەکات لە هەمان کاتیش ئاماژە بۆ نێوانی ئەو دوو جیهانەش دەکات هەروەك لەسورەتی الفرقان ئایەتی((٥٩)) هاتووە: ﴿الذي خلق السماوات والأرض وما بينهما﴾، ((خوا ئەو خوایەیە کەئاسمانەکان و زەوی دروست کردووەو هەروەها شتەکانی نێوانیشیانی دروست کردووە))، دروست بوونی ئەو نێوەندەش لەگەڵ دۆزینەوە نوێیەکانی پردەکانی مادە یەکدەگرێتەوە کەلەدەرەوەی سیستەمەکانی ئەستێرەناسی دا هەن. ئەو ڕوانینە گشتی‌یە بەدڵنیایی‌یەوە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کەچۆن قورئان و زانیاری‌یەکانی زانستی نوێ لەگەڵ یەك دەسازێن و هاوئاهەنگی پێك دێنن.

بەپێچەوانەوە کەلەکاتێکدا ئێمە لە قۆناغەیەکبەدوای یەکەکانی دروست بوونی بونەوەر لە ئینجیل ورد دەبینەوە

دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەو دەقانە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ زانستی نوێ تێك ناکەنەوە. بەتایبەتی ئەو دەقەی ئینجیل کە دروست بوونی زەوی(لە ڕۆژی سێیەم) وەپێش دروست بوونی ئاسمانەکان (لە ڕۆژی چوارەم) دێخێت. کەچی هەر چ نەبێ شتێکی باو هەیە دەڵێ ئەستێرەی ئێمە(زەوی) لەئەستێرەی خۆیەوە(خۆر) هاتووە.

ئا لێرەدا، چۆن دەبێ ئەوەمان بەخەیاڵ دابێ کە ئەو مرۆڤەی ئیلهامی لە ئینجیل وەرگرتبێ، نوسەری قورئان بێ؟! چۆن ئەو مرۆڤە لەخۆیەوە دەتوانێ دەقی ئینجیلی ڕاست بکاتەوە و چەمکێکی گشتی بەدەست بێنێ کە پەیوەندی بە دروست بوونی بونەوەرەوە هەبێ؟! لەکاتێکدا ئەو چەمکە زانستی‌یەی کە محمد - ﷺ - هێنای بەچەندان سەدە دوای مردنی خۆیشی کەس دەرکی پێ نەکردووە؟!

# بابەتی دووەم

# ئەستێرە ناسی: ڕووناکی و جوڵانەوە

هەر کاتێك لەو بابەتە ورد دەبمەوە، ئەوا یەکسەر دەست پێشخەری قورئان خۆی دەسەپێنێ. ئەو وەسفەی قورئان بۆ ئەستێرەناسی لەڕاستی‌دا نابێ وا لە ڕۆژئاوایی‌یەکان بکات کەدان بەو ڕاستی‌یە نەنێن، چونکە هەر هیچ نەبێ عەرەبەکان لەبواری ئەستێرەناسی بەماوەیەکی درێژ پێش ئەوروپی‌یەکان چەندان دۆزینەوەی گرینگیان ئەنجام داوە. ئەم هەڵوێستەش لەڕاستی‌دا فکرەیەکی چەوتی بێوێنەیە کە لە نەزانی‌و بێئاگایی لە مێژوو سەرچاوەی گرتووە. لە قۆناغی یەکەمدا، ماوەیەکی زۆر بەسەر هاتنەخوارەوەی قورئان بەسەرچوو ئەوسا

زانست لە وڵاتی عەرەبەکان پەرەیسەند. لە قۆناغی دووەمدا، ئەو زانستەی لە شارستانی ئیسلامیدا لەپۆپکە بوو نەیتوانی بوارێك بۆ مرۆڤ فەراهەم بێنێ بۆ ئەوەی چەند بەیانێك، وەك ئەوانەی لەقورئان دا هەن، لەبارەی ئاسمانەکان بنووسن. لێرەدا جارێکیتر بابەتەکە زۆر فراوانە، بۆیە هەر هێندە دەشێم کە فکرە گشتییەکە بخەمەڕوو. کاتێك ئینجیل لە دوو ڕۆناکی دەستکرد " خۆر" و " مانگ " – کە قەبارەیان جیاوازە – دەدوێ، ئەوا قورئان بە بەکارهێنانی دووسیمای جیاوازەوە لەیەکیان جیادەکاتەوە: ڕۆناکی – نور – بۆ مانگ و گوزە ڕۆناکی – سراج – بۆ خۆر((١١)). مانگ جەستەیەکی جامیدە وڕۆناکی دەداتەوە بەڵام هەرچی خۆرە دامەزراوێکی ئاسمانییەو لەباری سوتانی هەمیشەیی دایە و سەرچاوەی ڕۆناکی و گەرمییە.

وشەی " ئەستێرە " – نجم – هەمیشە وشەیەکی وەسفی لەدوادێت ودیاردەخا کە دەسوتێ و خۆی

دەسوتێنێ دەمێك درِ بە تارمایی شەو دەدات. ئەو وشەیەش کە ئەو دەورە دەبینێ وشەی " ثقب " ە.

لە قورئاندا وا پێدەچێ وشەی " کوکب " ئەو کاهکێشانە بگەیەنێ کەدامەزراوی ئاسمانین و شەوق دەدەنەوە، بەڵام وەك خۆر ڕۆناکی بەرهەم ناهێنن((١٢)). ئەمڕۆ دەرکەوتووە کە چۆن دامەزراوە ئاسمانی‌یەکان بەهۆی شوێنەکانی ئەستێرەکان لەنێو بازنەیەکی دیارکراودا هاوسەنگی پێك دەهێنن. هەروەها نابێ دەوری تێکچڕانی هێزە ڕاکێشەرەکانیش لەبیر بکەین کەپەیوەندی‌یان بەچەندێتی و خێرایی جوڵانەوەی ئەو دامەزراوانە هەیە. بەڵام بابزانین کەبنەچەی ئەو هاوسەنگی‌یە لەقورئانی پیرۆز بە وردی وەسفی‌لێ‌نەکراوە. ئەوەتە قورئان لەسورەتی الأنبیاء ئایەتی((٣٣)) ئاماژە بەو ڕاستی‌یە دەکات کە تەنها تازە لەڕۆژگاری ئەمڕۆ کە زانست لەپۆپکەدایە، دەرکی پێ‌دەکرێ: ﴿وهو الذي خلق

الليل والنهار والشمس والقمر كل في فلـــك يســـبحون﴾ الأنبياء:(٣٣)

" هەر خوایە کەشـەو و ڕۆژ و خـۆر و مـانگی دروست کردووەو و هەریەکەو لەخولگەی خۆی دەخولێتەوە ".

ئـەو وشـە عەرەبیـیەی کـە تـەعبیر لـەو جولآنەوەیـە دەکات، وشەی " سبح "یە کە لە دەقە قورئانییەکەدا بـە " یسبحون " هـاتووە. ئـەو وشـەیە فکرەیـەکی گشـتی لەبارەی جولآنەوە لەخۆ گرتووە جا با ئـەم جولآنەوەیـە، جولآنـەوەی قـاچی مرۆڤێـك بـێ لەسـەر زەوی یـان جولآنـەوەی تـەنێك بێ لـەناو ئـاودا. لـەبارەی جەسـتە ئاسمانییەکانەوە، مرۆڤ ناچار دەبێ کە وشە ڕەسـەنەکە بـەگوێرەی واتـا بنەڕەتییەکـەی خـۆی تەرجومـە بکـات کەئەویش بەو شێوەیە دێت: " گەشت بە جووڵـەی خـودی خـۆی بکـەی ". لەوانەیـە وا زەن بـبرێ کەوەسـف کردنـی ماوەی زەمـەنی شـەو و ڕۆژ مەسـەلەیەکی سادەوسـانابێ، بەڵام لەڕاستیدا وانییە، چونکە ئەومەسەلەیە لەقورئان دا

بەزمانێك دەربڕاوە ئەمڕۆکە جێگای بایەخ وگرنگی پێدانە، قورئان کرداری " کوّر " لەسورەتی الزّمر ئایـەتی((٥)) بـۆ وەسف کردنی ئەو ڕێگایە بەکار دێنیّ کە شەو خۆی لەڕۆژ دەپێچیّ و ڕۆژیـش هـەمان ڕێگـە لـە بەرامبـەر شـەودا دەگرێتەبـەر. بـەگوێرەی واتـای بنـەڕەتی کردارەکـەش "کـوّر" ئـەوا مەسـەلەکە بریتی‌یـە "پۆپـە بەسـتن لەچواردەورەی سەر".

ئەمەش لەیـەك چوونێکـی زینـدوو دەبەخشـیّ، چونکـە لەسەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئان دا، زانیاری پێویسـت لـەبارەی ئەستێرەناسـی‌یەوە هێنـدە نەزانرابووکـە مـرۆڤ ئـەمڕۆ لەمەسـەلەکە حـاڵی‌بیّ. ئەمـەو لـەقورئان دا باسـی پـەیدابوونی ئاسمانـەکان هـەروەها فکـرەی دابـین کردنـی شوێنێکی چەسپاو بۆ خۆریش هاتووە. ئـەو ڕاسـتی‌یانەش دەقاو دەق لەگەڵ فکرە زانستی‌یە نوێیەکاندا تەبایی‌یەکی تەواو پێکدێنن. لەو بارەیەوە قورئان باسی زۆر شتی تـری تێدایە وەك فراوان بوونی بوونەوەر((١٣)) هەروەها شیانی

مرۆڤ بۆ دەست بەسەراگرتنی بۆشایی ئاسمان. هەر لەو ڕوانگەوە بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای نوێوە مرۆڤ توانی گەشت بۆ سەر مانگ بکات. تاوێك بەدڵنیاییەوە ئەو ئایەتەی سورەتی الرحمن دەخوێنیتەوە، یەکسەر بیر دەبوژێتەوەو بەرامبەر مەزنێتی پەروەردگاری مەزن دەستەوەسان دەبێ: ﴿يا معشر الجن والإنس إن استطعتم أن تنفذوا من أقطار السماوات والأرض فانفذوا لا تنفذون إلا بسلطان﴾ الرحمن: (٣٣)

"ئەی کۆمەڵی جنۆکەو مرۆڤ ئەگەر توانیتان بچنە جەمسەرەکانی ئاسمانەکان و زەوی، بڕۆن بەڵام ناتوانن بچن تەنیا بەئیرادەی خوا نەبێ" بێ گومان، سەرچاوەی ئەو هێزەش هەر خوای گەورەیە. بابەتی سەراپای سورەتەکە داواکردنە لە مرۆڤ کە بە خۆی دا بچێتەوە و دان بە چاکەکانی خوای گەورە دابنێ بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی.

# بابەتی سێیەم:

## زەوی

بائێستا بێینە سەر باسی زەوی و بەدیقەتەوە ئەو ئایەتەی سورەتی الزّمر بخوێنینەوە:

﴿ألم تر أن الله أنزل من السماء ماءاً فسلكه ينـــابيع في الأرض ثم يخرج به زرعا مختلفا ألوانه﴾ الزمر:(٢١)

" ئایا ئێوە نابینین کە خودا لە ئاسمانەوە ئاوی باراندووەو هەر ئەو ئاوەش بەناو کانیاوەکاندا بۆ زەوی بردووە؟ لەپاشان هەر خودا خۆی کێڵگەی بە پیت و ڕەنگی جیاوازی لێپێك هێناون بۆ ئەوەی ڕووەك سەوز بێت. "

ئەمڕۆ لەچەرخی ئێمەدا ئەو بیرۆچکانە تەواو ئاسایین بۆ ئێمە، بەلاّم نابێ ئەوەش لەبیر خۆمان ببەین کە ئەو

بیرۆچکانە ماوەیەکی زۆر بەر لە ئێستا نەزانراون و مرۆڤ پەی پێنەبردوون. هەموو زانیاری ئێمە لەبارەی ئەم خاڵەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شاسزدەهەم ئەویش کاتێك بیرنارد پالیس وەسفێکی وردی لە بارەی سوڕاندنەوەی ئاو پێشکەش کرد. (بە واتای بەر لە بێرنارد کەس دەرکی بە ڕاستی ئەو مەسەلەیە نەکردبوو).

پێش دۆزینەوەکەی پالیس، خەڵك لەبارەی بیردۆزێکەوە دەدوان، بەگوێرەوی ئەو بیردۆزە: لەژێر کاریگەری "با"، ئاوی ئۆقیانوسەکان بەرەو نێوەوەی کێشوەکان دەخشان و لەپاشان لە ڕێی گەڕێکی مەزنەوە بەرەو ئۆقیانوسەکان دەگەڕانەوە، لەچەرخی ئەفلاتونەوە ناوی لێنرابوو تاتاریۆس. لەسەدەی حەفدەمی زاییینیش، پیتۆلێکی وەك دیکارت باوەڕی بەو تیۆرە هەبوو. ئەمەو تاکو لەسەدەی نۆزدەهەمیش مشتومڕ لەسەر تیۆرەکەی ئەرستۆ هەر درێژەی هەبوو. بەپێی تیۆرەکەی ئەرستۆش: ئاو لەئەشکەوتی چیا ساردەکانەوە

چڕدەبێتەوەو لەئەنجامدا گۆمی ژێر زەمینی پێك دێنێ کە ئاو دەدەنە کانی‌یەکان. ئێمە ئەمڕۆ دەزانین کە ڕژاندنی ئاوی باران ئەو کردارە بەڕێوە دەبات. ئەگەر یەکێك بەووردی بەراوردێك لەنێوان ئاوزانی- هایدیۆلۆژی - نوێ و ئەو هەموو بەیانە زۆرانەی قورئان لەو بابەتە بکات، ئەوا لەدان نان بە هاوئاهەنگی و سازانی قورئان و ئاوزانی نوێ هیچی‌تری بۆ دەرناکەوێ .

لەزەوی ناسی‌دا تازە دیاردەی پێچاوپێچی زەوی دۆزراوەتەوە، وا زەن دەبرێت کە ئەودیاردەیە شێوەی زنجیرەیی چیاکانی پێك هێنابێ. هەمان بۆچوونیش سەبارەت بەبەرگی دەرەوەی زەوی، کەلە سەدەفێکی ڕەق دەچێ، دروستە. مرۆڤیش لەسەر ئەو بەرگە ڕەقەی زەوی دەژیت.

ئەمەو هەرچی چینە قووڵەکانی تری زەوین، ئەوا گەرم و شلن و قاقڕیك پێك دەهێنن بەکەڵکی هیچ جۆرە ژیانێك نایەن. هەروەها شتێکی بەڵگەنەویستە، کەچەسپاوی

چیاکـان پـەیوەندی بـەدیاردەی بـەرز و نزمـی زەویـیـەوە هەیـە، چونکـە هـەر پێچاو پێچی زەویـە کـە پێویسـتـە بناغەیەك بۆ بـەرزو نزمـی زەوی دابرێـژێ کـەچیاکان پێـك دێنن.

بائێستا بەراوردێکی ئەو فکرە نوێیانە لەگەڵ ئایەتێك لـەنێو هـەموو ئـەو ئایەتانـەی قورئـاندا بکـەین کـە لـەو بابەتـەوە دەدوێـن. ئـەو ئایەتـەش ئایـەتی(٦ و٧) ی سورەتی((النبأ))ە:- ﴿ألم نجعل الأرض مهادا(٦) والجبـال أوتادا(٧)﴾ النبأ:٦-٧.

" ئایا ئێمە زەویمان نەکردۆتە شوێنی ژیان و گوزران و چیاکانیشمان لەزەوی چەسپ نـەکردووە؟ سـنگەکان – أوتاد – کە بە ناو زەویدا دەچن، وەك ئەو سنگانەن کەبۆ چەسـپ کردنـی ڕەشمـاڵ بـەکاردێن، بناغـە قوڵـەکانی پێچـاوپێچی زەوی پێـك دێنـن. لـێرەدا، هـەروەك لەبابەتەکانی تریشدا، ئەو مرۆڤەی بەچاوێکی بابەتیانە لەو مەسەلە بڕوانێ ئەوا بێگومان زوو دەرك بـەوە دەکات کـە

ئەو زانیاریانەی نێو قورئان لەگەڵ زانیاری‌یەکانی زانستی نوێ هیچ ناکۆکی‌و ناتەبایی پێك ناهێنن، بەڵکو لە هاو ئاهەنگی‌یەکی هارمۆنی‌دان. وێڕای ئەمەش، بەش بەحاڵی خۆم لە سەرەتاوە واقم وڕما کەبینیم چەند ئایەتێك لەقورئان باس لەشتە زیندووەکانی جیهانی ڕووەك و گیانەوەر دەکەن بەتایبەتی لەبارەی لەدایك بوونەوە. پێویستە جارێکی تر داکۆکی لەو ڕاستی‌یە بکەم کەتەنیا لەچەرخی نوێدا بەهۆی پێشکەوتنی زانستی توانراوە ناوەڕۆکی زانستی ئەو ئایەتانە بۆ ئێمە دەربکەوێ.

زۆر ئایەتی تر هەن، کەتێگەیشتنیان لەڕواڵەتدا ئاسانترە، بەلاّم هەر یەك لەو ئایەتانە واتایەکی بایۆلۆژی‌لەخۆ گرتووەو ئەو لایەنەش بایەخ و گرنگی‌یەکی زانستی گەورەی هەیە. ئەو ڕاستی‌یە زانستی‌یەی سەرەوە لەسورەتی((الأنبياء)) بەیان کراوە: ﴿وَجعلنا من الماء كلِّ شيء حي أفلا يؤمنون﴾ الأنبياء: (٣٠)

" ئێمە لەئاوەوە هەموو شتێکمان زیندوو کردووە، هێشتا باوەڕ ناهێنن؟" زانستی نوێش دووپاتی ئەوە دەکات کە ینەچەی ژیان لەئاوەوەیە. لە سەردەمی – محمد–((ﷺ)) لە هیچ ولاتێك ڕووەك زانی هێندە پێش نەکەوت بوو کەجاری ئەوەبدات بەشی مێو نێر لەڕووەکدا هەیە. کەچی ئەو ڕاستییە، ئێمە لەئایەتی(٥٣)ی سورەتی((طه)) بەرچاومان دەکەوێ: ﴿وأنزل من السماء ماء فأخرجنا به أزواجا من نبات شتى﴾ طه: ٥٣ " خوا باران لە ئاسمانەوە دەبارێنێ بۆئەوەی بەهۆی ئەو بارانەوە هەموو نێرو مێیەك لەگیاو ڕووەکی جۆراوجۆردا بڕوێنێ."

تازە ئاستی زانیاری ئێمەی مرۆڤ گەیشتۆتە ڕادەیەکی بەرز کە بتوانێ دەرك بەوە بکات کە مێوە لەو ڕووەکانەوە وەبەرهەم دێ کە سیماو تایبەتمەندێتی جنسییان هەیە(مێوە لەگوڵێکی نەزۆکی وەك مۆزیش پەیدا دەبێ) ئەو ڕاستییە زانستییە بنبەستەش

لەئایەتی(٣)ی سورەتی الرعد:﴿ومن کل الثمرات جعل فیها زوجین اثنین﴾." خوای گەورە لە هەموو مێوەیەکی رووەکی جۆراو جۆردا، جووتەی دوو بە دووی پێکهێناوە".

کرداری دروست بوونیش لەگیانەوەر و مرۆڤ دا لەیەك نزیکن. ئێمە لەمەو دوا بەوردی لە هەردوولا دەکۆڵینەوە. لە بواری فسیۆلۆژیدا تاکە ئایەتێك هەیە کە بۆ من گرنگی‌یەکی رادە بەدەری هەیە. هەزار ساڵ بەر لەدۆزینەوەی کرداری سورانی خوێن و نزیکەی سێزدە سەدەش پێش ئەوەی مرۆڤ بتوانێ فامی ئەوە بکات کەچی لە گەدە روودەدات بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە بە هۆی کرداری مژینی هەرسکردنەوە ئەندامەکان ئاو دەدرێن، ئایەتێك لە قورئاندا بەوردی وەسفی ژێدەری پێکهێنەرەکانی شیر دەکات. ئەو وەسفە وردەی قورئانیش لەگەڵ بیرو بۆچوونە گشتی‌یەکانی ئەمرۆکەدا تەبایی‌و هاوئاهەنگی‌یەکی تەواو پێکدەهێنن بۆ ئەوەی

زیاتر لەو ئایەتە بگەین، ئەوا دەبێ بزانین کە کاردانەوەی کیمیایی لە گەدە ڕوودەدەن لەپاشان هەر لەوێوەوەش ماددەکان لەڕێگای نیزامێکی ئالۆزەوە لە خۆراکەکەوە جیا دەکرێنەوە. هەندێك جار ئەو کردارە لەڕێگای جگەرەوەش مەیسەر دەبێ، بێ گومان ئەوەش دەوەستێتە سەرسروشتی کیمیایی ماددەکانەوە. خوێنیش لەلایەن خۆیەوە ئەو هەموو ماددانە بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش دەگوازێتەوە. ڕژێنە شیردەرەکانی بەرهەم هێنەری شیر لە نێو ئەو هەموو ئەندامانە دان. بێئەوەی درێژەی بدەینێ، دەتوانین بەشێوەیەکی سەرەکی بڵێین کە هەندێ ماددە، کە لە ناوەڕۆکەکانی گەدەوە بەرەو مولوولەکانی دیواری گەدەوە دێن، جۆگەی خوێن هەڵدەستێ بەگواستنوەیان بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش. ئەو چەمکە تەواو دەرکی پێدەکرێ و سەنگی خۆی وەردەگرێئەگەر بێتو بتوانین تەواو لە ئایەتی(٦٦) ی سورەتی((النحل)) حاڵی بین: ﴿وإن لكم في الأنعام لعبرة

نسقيكم مما في بطونه من بين فرث ودم لبنا خالصا ســــائغا للشاربين﴾ النحل: ٦٦. " دەبێ ئێـوە ئـەی مـرۆڤ پـەندو عیبرەت لەمەڕ و مـالآت وەربگـرن کـە بـە فـەرمانی خـوای گەورە لەناو سکی مـەڕو مالآت لـەنێوان خوێـن و خۆراکدا شیرێکی پاك و خۆش دەردەچێ بۆ ئەوانەی دەینۆشن.

# بابەتی چوارەم:

# خەڵق کردنی مرۆڤ

بابەتی خـــەڵق کردنــی مــرۆڤ لــە قورئــاندا بــەرەو چـەندەها بـەیان و بڕیارمـــان دەبــات. هــەروەها قورئــان ڕووبـەڕووی زانایـانی کۆرپـەلـەزانی ڕادەوەســتێ کەلەمـــەڕ خـەڵق کردنـی مـرۆڤ تەنـها جـەخت لەسـەر تەفسـیر و لێکدانەوەی مرۆڤ دەکەن.تـاکو زانستە بنچینەیی‌یەکان، کــەهاوکاری زانیاری‌یــەکانی مـــرۆڤ دەکــەن لـــەبارەی بایۆلۆژی، نەهاتنەکایەوەو بەشێوەیەکی تایبەتیش وردبین دانـەهێنرا، مـرۆڤ نـەیتوانی لـەو هـــەموو بەیانانــەی نێــو قورئان بگات. ئەو ڕاسـتی‌یە موتلەقـە، سـورترمان دەکـات لەسەر ڕای پێشوومان.چونکە بەهیچ جۆرێـک ژێـری مـرۆڤ ناسەلمێنێ، کەئەو هەموو بەیانانە کـەتازە بـەتازە مرۆڤـی

سـەردەمی نـویێ لـــەڕێگای دەزگــا زانســتیی‌یەکان لیێ تیێدەگات، مرۆڤێکی بەرایی چەرخی حەوتەمی زایینـی دایهێنابیێ. ئەمەو هیچ شتیێ نی‌یە کە دووپاتی ئـەوە بکات کە مرۆڤەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و جـەزیرەی عـەرەبی لەبابـەت دروســت بوونـی مرۆڤـەوە شـتێکی زیاتریـان لەمرۆڤەکانی ئەورووپا یان هەر شـوێنێکی دی جیـهان زانـی بیێ. ئـەمڕۆ لـەنێو موسـڵمانان کەســانێکی زۆر هــەن کـە خـاوەن زانیـاری زۆرن هـەم لـەبارەی قورئانــەوە وەهــەم لەبارەی زانستی سروشتی‌یەوە، ئێستا ئەو زانایانـە تـەواو دەرك بەو لەیەك چوونانەی نێوان ئایەتەکانی قورئان – کە لەبارەی خەلق کردنی مرۆڤەوە دەدوێن– و زانیاری‌یەکانی مرۆڤدەکەن. بـەش بـەحاڵی خـۆم، قـەت قسـەی ئـەو موسڵمانە هەژدە ساڵی‌یەی سعودیە لـەبیر ناکـەم کـە لـە بارەی خەلق کردنی مرۆڤـەوە بـە پشـت بەسـتن بـەقورئان وەلامـی سـەرچاوەیەکی دەدایـەوە. لاوە موسـڵمانەکە ئاماژەی بۆ ژێدەرەکە کردووتی: " ئەم کتێبـە – قورئـان – هەموو زانیاری‌یەکی سەرەکیمان سەبارەت بە مەسەلەی

خەڵق کردنەوە پێدەبەخشێ.ئەمەو کاتێ لەقوتابخانە بووم، مامۆستاکان لەسۆنگەی ئایەتەکانی قورئانەوە بۆیان شیدەکردینەوە کەچۆن منداڵ لەدایك دەبێ کەچی کتێبەکانی ئێوە سەبارەت بە ڕۆشنبیری جنس چیغ چووینەوە!"

لەو خاڵەدا ئەوە دەبینێ کە هەڵوەستەیەك بکەین بەوەی لە سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئاندا زۆر باوەڕی بڵاو هەبوون کەپڕ بوون لەخەرافات و ئەفسانەدا، بەڵام هیچ کام لەو باوەڕە پڕو پووچانە لە نێو قورئاندا نین هەر لەو پێودانگەوە دەبینین قورئان دوورە لە هەموو جۆرە بیرو باوەڕێکی پووچ و خەرافات و ئەفسانەدا هەر ئەمەش وای کردووە کەبەیانەکانی قورئانی پیرۆز لەگەڵ بەیانەکانی زانستی نوێ زۆر بەئاسایی بسازێن و هیچ هەڤدژییەك دروست نەکەن.

با ئێستە زیاتر لەپرۆسەی خەلق کردنی مرۆڤ ورد بینەوە: ئەو هەموو بیرە وردانەی لە ئاڵۆزی شلەیەکی سازگار دەکۆڵنەوە، پێ لەسەر ئەوە دادەگرن، کە

ڕێژەیەکی یەکجار بچوك لەو شلەیە پێویستە بۆ ئـەوەی – پاکی – یاخود بە پیتی، جەوهەری ماددەکە بچەسپێنێ.

ئەمەیان تەرجومەیـەکی وردی وشـەی " سـلالە " یـە، بەشێوازێکی تر، وشەی "سلالە" ی قورئـان پـڕ بەپێسـتی لێکدانـەوە ئالۆزەکـەی زانسـتی نوێیـە. لەلایـەکی تریـش لەڕێگای وشـەی "عەلـەق"ی قورئانـەوە خـوای گـەورە لـە چـەندان ئایـەت بـە وردی باســی پیتـاندنی هێلکـەی لــە ئەندامی زاوزێی مێیەدا کردووە. ئەوەی شایانی باس بێ، وشەی " علق " ناونیشـانی سورەتێکی قورئانـە، لەیـەکێ لەئایەتەکان باسی "علق" ئاوا هاتووە: ﴿خلق الإنسان من علق﴾ العلق: ٢. " پەروەردگار مرۆڤی لە پارچـە خوێنێـك، کـە یـەکدەگرێت، دروسـت کـردووە"، بەباوەڕی مـن هیــچ وەرگێڕانێکی شیاو بۆ وشـەی" علـق " نیـیە، بێجگـە لـە بـەکارهێنانی واتـای ڕەسـەنی خـۆی نـەبێ. گەشـەکردنی کۆرپەلــەش لــەنێو ڕەحمــی دایکــدا بــەکورتی وەســفی لێکراوە، بەلاّم وەسفەکە زۆر وردە، چونکە ئەو چەند وشە سـادەیەی ئامـاژە بـۆ کۆرپەلـە دەکـەن بەتـەواوی لەگـەڵ

قۆناغە بنەڕەتی‌یەکانی گەشەی کۆرپەلە دەگونجێن. ئەو راستی‌یەش ئێمە لەئایەتی((١٤)) ی سورەتی((المؤمنـــون)) دەخوێنینەوە: ﴿ثم خلقنا النطفة علقة فخلقنا العلقة مضغـة فخلقنا المضغة عظاما فكسونا العظام لحما ثم أنشأناه خلقـــا آخر فتبارك الله أحسن الخـــالقين﴾ المؤمنـــون:١٤. ((دوای پشکە ئاومان گێڕا بەپشکە خوێنێکی تیر و هـــەر لـەو خوێنـەوە پارچـــە گۆشـتمان دروسـت کـرد و هـــەر لـەو گۆشتەوەش ئێسکەکانمان دروست کرد و ئێسکەکانیشمان بەگۆشت داپۆشی‌و ئینجـا بـە شێوەیەکی مرۆڤـی خـاوەن لەش و ئەندامامان دروست کرد. پـاکی‌و گـەورەیی هـەر بۆ ئەو خوایەیە کە باشترین داهێنەرە.))

وشەی قورئانی "مضغة" - پارچەگۆشتێکی بـێ ئێسـک - تەواو وەسفی ئەو قۆناغە دیارەی پەرەسەندنی کۆرپەلە دەکات، کەزانستی نوێ ناوی دەنێ دەرکـەوتنی کۆرپەلـە، ئـــەو دوو وەســفەی قورئــان و زانســـتی نوێـــش تـــەواو یەکدەگرنـەوە. شـتێکی زانـراوە، کـە ئێسـکەکان لـە نێـــو ئەوکوتلانـــە پەرەدەســێنن کـــە لەپاشـــان بـــە ماســـولکە

دادەپۆشرێن، ئـەو قۆناغـەی پەرەسـەندنی کۆرپەلـەش لەقورئان دا بە وشـەی " لحم "((گۆشتی پـاك)) وەسفی کـراوە. کۆرپەلـە بـەقۆناغێکی‌تر دادەچیّ، لـەم قۆناغـەدا هـەندێك لـە ئەندامـەکانی تـەواون کـەچی هـەندێکی تـری ناتـەواون. لـەدوا قۆناغیشـی دەبـیّ بـە مـرۆڤ! ئـەو بۆچوونانـەش لەوانەیـە بەدروسـتی واتـای ئایـەتی(٥)ی سورەتی((الحج)) بێت: ﴿فإنا خلقناکم من تـراب ثم مـن نطفة ثم من علقة ثم من مضغة مخلقة وغير مخلقة﴾ الحج:٥.

" بەڕاستی ئێمە ئێوەمان لە خۆلّ دروست کردووە، لە پاشان ئێوەمان لە پشکە ئاوێك دروست کـردووە، لـە پاشان هەر ئەو پشکە ئاوەمـان گێڕا بـە پارچـە خوێنێـك، ئەو پارچە خوێنەشمان گێڕا بە پارچە گۆشتێکی بیّ ئێسك و خاو کە هەندێك لە ئەندامـەکانی تـەواون وە هـەندێکی‌تر ناتەواون".

کە خوای گەورە دەفەرمویّ ئێوەمان لە خۆل دروسـت کردووە مەبەستی لە دروست کردنی حـەزرەتی ئادەمـە - دروود و سـلاوی خـوای گـەورەی لیّ بێـت - وە کـە

دەفەرموێ‌ئێوەمان لە پشکە ئاوێك..... دروست کـردووە، مەبەستی دروست بوونی مرۆڤە بەهۆی کرداری زاوزێی ژن و پیاوەوە.

لەمـــەش زیـــاتر، خـــوای گـــەورە لەئایـــەتی(٩)ی سورەتی((السـجدة)) باسـی بـە دەرکـەوتنی هەسـتەکان و ڕێخۆڵەمان بۆ دەکات:﴿وجعل لكـم السـمع والأبصـار والأفئدة قليلا ما تشـكرون﴾ السـجدة:٩. "ئـەی مـرۆڤ خوای ئێوە بە ئێوەی بەخشیوە هەستەکانی گوێ لێبـوون و بینین و دڵ". لێرەدا جارێکی تـر دووپـاتی دەکەینـەوە کە ئەو ڕاسـتی‌یە بەڵگەنەویسـتانەی قورئـان تـەواو لەگـەڵ زانیاری‌یەکانی زانستی نوێ دەگونجێن. لەمەش زیاتر، ئەو ڕاستی‌یانە ئەوە دەردەخـەن کـە هیـچ بـیرێکی نـامۆو پـڕو پوچی سەردەم نەکەوتۆتە نێو قورئان.

# بابەتی پێنجەم:

# قورئان و ئینجیل و زانستی نوێ

ئێستا دێینە سەر دوا بابەت:

دوابەشمان بریتی‌یە لە بەراوردکردنی چەند دەقێکی قورئان و ئینجیل لەگەڵ زانستی نوێدا. دەمێك لەو چەند لاپەڕەی پێشوو لە بابەتی((خەلق کردن)) دا دوایین سەرنجمان بۆ هێندێك کێشە ڕاکێشان. لە بەرایی‌دا دووپاتم کردەوە کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەڕووی زانستی‌یەوە تەواو لەگەڵ بیر و بۆ چوونەکانی زانستی نوێ دەسازێن، هەروەها جاڕی ئەوەشم دا کە چیرۆکەکانی نێو ئینجیل هێندێك(بەیاننامە) یان لەخۆ گرتووە کە لەسۆنگەی زانستی نوێوە بەهیچ جۆرێك وەرناگیرێن. کاتێك لە دەقی ئەو چیرۆکە مەزنەی نێو ئینجیل لە بارەی خەلق کردنەوە

ورد دەبینەوە سەرسامی‌یەکی دژوار دامان دەگرێت بەوەی هەر زوو بۆت دەردەکەوێت ئەو چیرۆکە دەستکردی ئەو قەشانەیە کە لەچەرخی شەشەمی بەر لە زایین ژیاون. هەر چیرۆکەکە، چیرۆکێکی کەهنوتی ڕووتە وا پێ‌دەچێت ئەو چیرۆکە وەك مەغزای خوتبەیەکی ئایینی بیری لێکرابێتەوە هەر بۆ ئەوە دارێژرابێت کە خەڵك هاندەن پەیڕەوی فەرمایشتەکانی ڕۆژی پەرستن بکەن((١٤)) چیرۆکەکە بە نیازێکی ئاشکراوە دارێژراوە، هەروەك((Father De Vaux))ی سەرۆکی پێشووی قوتابخانەی ئینجیل لە قودس، ئاماژەی بۆ کردووە. هەروەها ئینجیل چیرۆکێکی دی گەلێك کورت ترو کۆنتری لەبارەی سەربردەی دروست بوونەوە تێدایە کە ناسراوە بە دەقی(پەرستنی یەهوە)((١٥)) کە لە گۆشە نیگایەکی تەواو جیاوازەوە دەڕوانێتە بابەتەکە. ئەو دوو چیرۆکە هەردووکی لە((Genesis – پەڕتوکی دروست کردن–))

دەرهێنراون. پـەرتوکی دروست کـردن یەکـەم پـــەرتوکی پێنج پەرتووکەکەی موسایە یان تەوراتە.

وازەن دەبرێت کە مووسا پێغەمبەر- درووود و ســلاوی خوای گـەورەی لیٚ بێـت - نوسـەری ئـەو پەرتووکـە بێـت. بـەلام ئـەو دەقـــەی لـەلای ئێمەیــە، هــەروەك دەزانــین، چەندەها گۆڕانی بەســەردا هـاتووە سـەربردەی قەشـەکان سەبارەت بە دروست بوون، هەروەك لە پەرتووکی دروست بوونـــەوە هـــاتووە بەڕەســـەن ناســـی‌یە ســـەیرو سـەمەرەکانی‌یەوە نـاو بـانگی دەر کـردووە کــە مێــژووی دروسـت بوونــی بوونـەوەر دەگەڕێنێتـەوە بــۆ ســەردەمی ئادەم پێغەمبەر- درووود و سلاوی خوای گـەورەی لیٚ بێـت - ئەمەشهیچ کەسێك بەڕاستی وەرناگرێت، وێڕای ئەمــەش هەندێك نوسەری پەیمانی نویٚ وەك (ماتیـــــــۆ) و لۆقــە، نزیکـــەی دەقـــاو دەق ئـــەو چیرۆکانـــەیان جـــارێکی‌تر داڕێژتیتـەوە، بـەلام مێـژووی زنجیرە نەژادی‌یەکـەیان لـــە عیسا پێغەمبەرەوە - درووود و سـلاوی خـوای گـەورەی لیٚ

بێت – دەست پێکردووە، هەرچی ماتیـــــــۆ (مەتی)یە ئەوا زنجیرە نەژادییەکە بۆ سەردەمی ئیبراهیم – درورد و سلاوی خوای گەورەی لیّ بێت – دەگەڕێنێتەوە، بەلام لۆقا زنجیرە نەژادییەکە دەباتەوە بۆ سەردەمی ئادەم پێغەمبەر – درورد و سلاوی خوای گەورەی لیّ بێت –.

ئەو هەموو نوسینانە لەڕووی زانستییەوە ! بەهیچ کلۆجێك وەرناگیرێن، چونکە هەریەکەیان((تەمەنێك)) بۆ گەردوون دادەنێن و لەلایەکی دیش، مێژوویەك بۆ پەیدا بوونی مرۆڤ لەسەر زەوی دادەنێن، ئەمەش بەشێوەیەکی تەواو و ئاشکراوە لە دەرەوەی ئەو بازنەی هەقیقەتی زانستی دەبێت کە زانستی نوێی لەسەر دامەزراوە. بە پێچەوانەی ئەوانەوە، قورئان هیچ بەیاننامەیەکی لەو جۆرەی تێدا نییە. لەبەرایییەوە سەرنجمان بۆ ئەوە ڕاکێشان کە قورئان لەسەر مەسەلەی دروست بوونی بوونەوەردا، تەواو لەگەڵ فیکرە گشتییە نوێیەکان دەسازێت، کەچی ئینجیل لەگەڵیان تێك ناکاتەوە. چیرۆکە ڕەمزییەکەی

دەریا بەرایی‌یەکان بەهیچ جۆرێك ناتوانرێت بەرگری لێبکرێت، هەروەها مەسەلەی دروست بوونی((ڕۆناکی))یش لەیەکەم ڕۆژدا لە پێش دروست بوونی((ئەستێرەکان))دا کە ئەو((ڕۆناکی) یە دەبەخشێت! هەروەها چەند شتێکی تر لە ئینجیل دا هاتووە کە لە ڕوانگەی زانستی نوێوە، ڕاست نین وەك پەیدابوونی(ئێوارە) و(بەیانی) بەر لە دروست بوونی زەوی‌و هەوەها دروست بوونی زەوی لە سێیەم ڕۆژ و دروست بوونی خۆر لە چوارەم ڕۆژدا. هەروەها دەرکەوتنی گیانەوەرانی سەر زەوی لەشەشەم ڕۆژ و دەرکەوتنی بالندەکانی ئاسمان لە پێنجەم ڕۆژدا. کە لە پاش و پێش کردنی دروست بوونی ئەو بوونانە ورد دەبینەوە دەگەینە ئەو قەناعەتە، کە ئەو بیرو بۆچوونانە بەرهەمی ئەو باوەڕە باوانەی سەردەمی نووسینی ئەو دەقانەن نەك دەقێکی ئاسمانی. لەمەش زیاتر، ئینجیل مێژوویێك بۆ تەمەنی بوونەوەر دادەنێ‌و دیارکردنی ئەو مێژووەش بنەچەی سالنامەی جولەکە پێك دێنێ.

بەگوێرەی ئینجیل ئەمڕۆ دەبێ تەمەنی بوونەوەر ٥٧٢٨ ساڵ بێ، ئەو بۆچوونەش بۆ تەمەنی بوونەوەر، مەحاڵە لەڕوانگەی زانستی نوێوە بەڕاستی وەربگیرێ.

دیدی زانستی نوێ بۆ ئەو مەسەلەیە بەم جۆرەیە: لەوانەیە تەمەنی نیزامی شەمسی ئێمە لە سەرەوەی(٤٠٥) بلیۆن ساڵ بێ و کاتی پەیدابونی مرۆڤیش لەسەر زەوی لەوانەیە دەیان هەزار ساڵ بێ! ئەگەر زیاتریش نەبێ! لێرەشدا، جارێکیتر قورئانی پیرۆز ڕەسەنێتی ئیلاهی خۆیدەسەلمێنێ بەوەی هیچ ئاماژەیەك بۆ دیاری کردنی((کات)) یاخود تەمەنی بوونەوەر و مرۆڤ لەخۆی ناگرێ.

خاڵێکی تر کەگرنگ و پڕ بایەخ بێ و ئەوەبێنێ ببێتە بابەتی بەراوردکردن لە نێوان قورئان و ئینجیل، مەسەلەی لافاوەکەیە. سەربردەکەی ئینجیل لەبارەی لافاوەکە، بریتییە لەتێکچرژانی دوو وەسفدا کەتێیدا ڕوداوەکان بەشێوەیەکی ئەستەم تێك دەکەنەوە. ئینجیل لەبارەی

لافاوێکی گەردوونی‌یەوە دەدوێ و بانگاشەی ئەوە دەکات کە ئەو لافاوە نزیکەی سێسەد ساڵ لەپێش سەردەمی ئیبراهیم –درووود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت– ڕوویداوە. بەگوێرەی ئەو زانیاری‌یەی ئێمە لەبارەی ئیبراهیمەوە هەمانە، دەبێ ئەو لافاوەی ئینجیل باسی دەکات لەدەوروبەری سەدەی بیست و یەك یاخود بیست و دووی پێش زایینی ڕووی دابێت. ئەو بیرۆچکەیەش دەگەڵ ڕاستی‌یە مێژوویی‌یەکان تێك ناکاتەوەو بەڕاست وەرناگیرێ، چونکە ئەو سەردەمەی کە ئینجیل بە سەردەمی لافاوێکی گەردوونی دادەنێ، یەکێك لەدەسەڵاتەکانی میسر فەرمانڕەوایی مەملەکەتی میسری کردووە. بەواتایەکی تر ئەگەر لافاوەکە کۆتایی بەشارستانی پێشوو هێنابێ، چۆن عەقڵ قەبوول دەکات کە لە هەمان کاتی لافاوەکە لە میسردا دەسەڵاتێك فەرمانڕەوایی کردبێ؟!

هەر لەو پێودانگەوە ناتوانین ئەو بەیانەی ئینجیل لە ڕوانگەی زانستی نوێوە بە ڕاست وەربگرین. لێرەش، مرۆڤ هەست بەکەلێنێکی گەورە دەکا لەنێوان قورئان- وەك دەقێکی ئیلاهی-و ئینجیل دا، بە پێچەوانەی ئینجیلەوە، قورئان لە تۆفانێك دەدوێ کەتایبەت بووە بە گەلی نوح پێغەمبەر- دروود و سلاوی خوای گەورەی لێ بێت -. ئەوەی ئێمە دەیزانین گەلی نوح بەهۆی گوناهەکانیانەوە، خوای گەورە بە تۆفان سزای دان هەروەك چۆن گەلانی دی گوناهبار بەکارەساتی دی سزا دراون. لەمەش زیاتر قورئان زەمەنێك بۆ تۆفانەکە دانانێت. بەشێوەیەکی بنبەست هیچ ڕاستییەکی شوێنەواری یاخود مێژوویی دژ بە سەربردەکەی قورئان ڕاناوەستێ!

سێیەم خاڵی بەراوردکردنی قورئان و ئینجیل، تابلۆی کرنگە: بریتییە لە سەرگوزشتەی موسا پێغەمبەر- دروود و سلاوی خوای گەورەی لێ بێت -، بەتایبەتی بەکۆمەڵ

دەرچوونی عیبری‌یەکانی میسر کە ڕازی نەبوون چی‌تر کۆیلەو عەبدی فیرعەون بن.

لێرەدا تەنیا پوختەیەکی لێکۆلینەوەکەم دەربارەی ئەو بابەتە پێش کەش دەکەم کە لە کتێبەکەمدا((قورئان و ئینجیل و زانست)) باسم کردووە. لەوبارەیەوە، تێبینی چەند خالێکم کردووە کە سەربردەکانی قورئان و ئینجیل لە هەندێك شوێن تێك دەکەنەوەو لە هەندێ شوێنی تر تێك ناکەنەوە. پاش ئەوەی زێتر لە بابەتەکەم کۆلی‌یەوە گەیشتمە چەند ڕاستی‌یەك بە جۆرێك لەهەندێك شوێن هەردوو دەقی قورئان و ئینجیل زۆر سوود بەڕای یەکتر دەگەیەنن.(بێگومان ئەگەر ئینجیل دەسکاری نەکرابا وەك دەقێکی ئیلاهی بمابوایە ئەوا حەتمەن دەقاو دەق وەك قورئان دەبوو).

کۆچڕەوە مەزنەکەی موسا پێغەمبەر-دروود و سلاوی خوای گەورەی لێ بێت-و هاوڕێکانی لە مێژووی فیرعەونەکاندا شوێنێکی مەزنی داگیر کردووە. جا کاتێ

لەو گریمانانەم کۆڵییەوە کە دەبارەی ئەو شوێنە مەزنـەی کۆچڕەوەکـە دەدوێــن، گەیشـتمە ئـەو قەناعەتــەی کـە ئیحتمالێکی زۆر هەیە کە " میرنابتـا " جێگری رامسێسـی دووەم، فیرعــەونی ســەردەمی ئــەو کۆچــڕەوەی موســا پێغەمبەر – درووود و سـلاوی خـوای گـەورەی لێ بێـت – و هاوڕێکانی بێ. ئەمەو لەیەك چوونی سـەربردەکانی کتێبـە پیرۆزەکـــان و بەڵگـــە شـــوێنەوارییەکان بـــەتوندی لەبـــەرژەوەندی ئـــەو گریمانـــەم دەدوێـــن، بـــەگوێرەی سەربردەی ئینجیل، دەتوانـین شـوێنی موسا پێغەمبـەر– درووود و سلاوی خـوای گــەورەی لێ بێــت –لــە مێــژووی فیرعەونەکان دیاری بکەین: موسا پێغەمبەر لـە سـەردەمی فەرمانڕەوایی رامسێسی دووەم لە دایك بووە. بەو شێوەیە بەیانەکەی ئینجیل لە چیرۆکی موسا پێغەمبەردا بەهایەکی مێژوویی گرنگی هەیە. ئەمــەو لێکۆلینــەوەی پزیشــکی لەســـەر جەســـتەی مۆمیــاکراوی میرنابتــا زانیارییـــەکی بەسوودترمان لەسەر هۆکارە بەرجەسـتەکانی مردنـی ئـەو

فیرعەونە پیٚدەبەخشیٚ لەڕاستیدا، ئیٚمە ئیٚستا جەستەی مۆمیاکراوی ئەو فیرعەونەمان لەبەردەستە کەبەشیٚوەیەکی دروست لە ساڵی ١٨٩٨ دۆزراوەتەوە. ئەو دۆزینەوەش بەیەکیٚك لە گرنگییە هەرە مەزنەکانەوە دادەنریٚ. لە ئینجیل دا هاتووە کە ئەو فیرعەونە لە دەریا وون بووە، بەلاٚم ئینجیل هیچ دریٚژە بەوە نادات کە ئاخۆ دوایی جەستەکە چی بەسەر هاتووە، هەرچی قورئانە، ئەوا لەسورەتی یونس، ئاماژە بەوە دەکات کە جەستەی فیرعەون، نەفرەتی لیٚبیٚ، لە دەریاکان دەپاریٚزریٚت: ﴿فاليوم ننجيك ببدنك لتكون لمن خلفك آية وإن كثيرا من الناس عن آياتنا لغافلون﴾ یونس: ٩٢ " ئەمڕۆ لاشەی مردووت دەپاریٚزین بۆ ئەوەی ببیە پەند بۆ ئەوانەی لە دوات دیٚن. بەزۆری زۆربەی خەڵك بیٚئاگان لەئایەتەکانی ئیٚمە."

ئەو تاقیکردنەوە پزیشکییەی لەسەر جەستە مۆمیاکراوەکەدا ئەنجام درا، ئەو ڕاستییە دوپات

دەکاتەوە کەنابێ ئەو لاشـەیە زۆر لـەنێو ئـاودا مابێتـەوە، چونکە لاشەکە هیچ نیشانەیەکی خەراب بوون – تێکچوون بەهۆی زۆرمانەوە لەژێر ئـاودا – لێ بـەدی نـاکرێ. لـێرەدا، جارێکیتر سـەربردەی قورئـان و تـێڕوانینی زانسـتی نـوێ هاوئاهەنگییەکی تەواوپێك دێنن.

پەیمـانی کـۆن، کـە لـە کۆمـەڵێك کـاری ئــەدەبی پێکهاتووە، واپێدەچـێ لـــە دەوروبــەری ســەدەی نۆیــەم نوسـرابنەوە. بێگومـان پـەیمانی کـۆن چـەندەها گۆڕانــی بەسـەرداهاتووە. بـەجۆرێك ئـەو بەشـەی کــە مـرۆڤ لــە داڕشتنی وشــە بەوشـەیدا بـە دەسـتکارییەوە زۆر زەق و بەرچاون بەواتای مرۆڤ بەئاسانی دەتوانێ دەقی ئیلاهیو دەقـی دەسـتکردی مـرۆڤ جیابکاتـەوە، کـەچی هــەرچی وەحی قورئانە، مێژوویەکی هەیە، ئەمەش بنەڕەتێکی یەك لاکـەرەوە لەگـەڵ مێــژووی پــەیمانی کـۆن و نـوێ پێـك دەهێنـێ. ئـەو وەحییــە ئیلاهییــەی قورئــان هــەر لــەو چرکەیەی بە مرۆڤ(محمد)– ﷺ– گەیاندرا یەکسەر لە دڵ

چەسپاو جیێی خۆی لەنێو دڵی مرۆڤدا کـردەوە. لەپاشـان هـەر لـە سـەردەمی پێغەمبــەر- ﷺ- دا، ئـەو وەحیـیـە ئیلاهییە نوسرایەوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ڕەسەنایەتی قورئان دەسەلمێنێو خوای گەورەش وەعدی ئـەوەی داوە کە خۆی قورئان بپـارێزێ و نـەهێڵێ مـرۆڤ بـە ئـارەزووی خۆی بیگۆڕێ.

ئەگەر بابەتییانە دیراسەیەکی هەمـە لایەنـەی قورئـان لەبەر ڕۆشنایی زانستی نوێ بکەین، ئەوا هەر ئـەوەمان بـۆ دەمێنێتەوە کەدان بە مەزنێتی قورئـان بنێـین بـەوەی کـە دەقێکی ئیلاهیـیـەو نـاوەڕۆکێکی گـران بـەهای لـە هـەموو لایەکەوە هەیە بەتایبەتیش لـەبواری زانسـتی و ئـەزموونی زانستییەوە. جا ئەو هــەموو ڕاسـتییە زانسـتییانە وامـان لێدەکەن کە ئەو بۆچوونە تەواو بــە نامـاقوول و نازانسـتی بزانین کە بانگاشەی ئەوە دەکات کە مرۆڤێك لەسـەردەمی پێغەمبــەر - ﷺ -(٥٧١-٦٣٤) نوســەری ئــەو هـــەموو بەیانە زانستییەی نێو قورئان بێ. ئەمـەو وێـڕای ڕاسـتیو

ڕاستگۆیی‌و ڕەسەنێتی قورئان کەدەقێکی ئیلاهی‌یە، باری زانستی سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئانیش ڕێمان نادات ئەو بۆچوونە ناماقولە بەڕاست بزانین. زۆر بیرو باوەڕو ئیعتباری واهەن کەخۆی لەخۆیدا بەشێکن لە وانەی کە شوێنێکی مەزن بۆ وەحی قورئان دادەنێن و، ئەمانەش وا لە زانای پاك و ڕاست ویست دەکەن کە لەبەرامبەر ئەو ڕاستی‌یانەدا دان بە ناتوانایی خۆی بنێت و خۆی ڕزگار بکات لە لێکدانەوەیەکی ماددی ڕووت.

# ڕووناكی سروشی خوا (١٦)

## دەروازەیەك:

### ١- ژیان چی‌یە؟

بوونی مرۆڤ لــەم جیهانــەو، دروســت بوونــی ســەراپای ئەو بوونــەوەرە تــەنیا ئاكـامی چــەند ڕووداوێك وە یـاخود بەرهەمی سروشتێكی ڕێكەوتی نین. ئەم بونەوەرە هــەموو دانــە ئــەتۆمێكی بانگمـان دەكـات، پێمـان پیشـان دەدات، بۆمان دەسەلمێنێت كــە " دروســتكەرێكی میـهرەبان و بــە بەزەیی وتوانا " لە پاڵ ئەو بونەوەرەیــە! هــەر بۆیــە ئــەو هــەموو شـتانە داوامـان لێدەكـەن كـــە دان بـــەبوونی ئــەو دروستكەرە كە((اللە))یە بێنین. بەبێ بوونی دروستكەرێك هیچ شتێك ناتوانێت ببێت؟!

هەموو تاكە گیانێك دەزانێت كە خۆی هەیەو، هەروەها دەزانێـت كـە بوونــی پاپــەندە بـەبوونی دروســتكەرێكەوە،

چونکە ئەو تاکە گیانە بەو پەڕی دڵنیایی‌یەوە چاك دەزانێت، ناتوانێت بەخۆی بوونی خۆی دروست بکات. لەو پێوانگە ژیری‌یەوە ئەرکی ئەو تاکە گیانەیە کە وەستای دروستکەری خۆی کە((خوا)) یە بناسێت.

## ٢- مرۆڤ - مرۆڤایەتی -

مرۆڤ گیانلەبەرێکی بێوێنەیە، خوا مرۆڤی وەك نوێنەری خۆی یاخود جێگری خۆی دامەزراندوە کە حوکمی هەموو گیانلەبەرەکانی دی جیهان بکات.مرۆڤ توانای ژیری پێبەخشراوە. ئەوە بەخشندەیی خوایە کە مرۆڤی لە هەموو گیانلەبەرانی تر جیا کردۆتەوە. لەو بارەیەوە پێغەمبەر- ﷺ -، دەفەرموێت:-

((خوا هیچ شتێکی باشتری لە - عەقل، ئەقل- بۆ مرۆڤ دروست نەکردووە. یاخود هیچ شتێکی لە عەقلی تەواوتر و جوان تری بۆ مرۆڤ دروست نەکردووە...))

عەقڵ وا لەمرۆڤ دەکا کە توانای خۆی بەکار بێنێ بۆ دەرك کردن بەشت و جیاکردنەوەی شتەکان. مرۆڤ سەربەستی -ئیرادەی ئازاد- ی پێدراوە بۆ ئەوەی بەئارەزووی خۆی ڕێگایەکی ژیان هەڵبژێرێت کە شایەن بەو پلەو پایە بێت، جێگری یان نوێنەری خوا بێت لەسەر زەوی یاخود گومڕا بێت و هێندە نفرۆی خراپە بێت وخۆی لەو پلەو پایەی خوای گەورە پێی بەخشیوە داشۆرێت. بە جۆرێك هێندە نزم بێت پلەو پایەی لە نزمترین گیانەوەر یاخود زیندەوەر نزمتربێت. مرۆڤ بەپاکیو بێگوناهەوە لەدایك دەبێت. ئیرادەیەکی ئازادی هەیە بۆ ئەوەی کردەوەی چاك ئەنجام بدات یاخود کردەوەی خراپ بکاو خۆی نقوومی گوناهان بکات.

٣- ڕابەری ئاسمانی:

لە شالاوی بەزەییو میهرەبانی خودا بۆ مرۆڤ ئەوەیە:

خودا مرۆڤی له تاریکی فەرامۆش نەکردووە بۆ ئەوەی هەر لە ڕێگای ئەزموون و هەڵەوە((ڕێگای ڕاست)) بدۆزێتەوە، بەڵکو وێڕای توانستی زەهنی مرۆڤ بۆ ئەوەی تەرازووی ڕاستیو زانیاریو هەقیقەتی بوونی ئێمە لەم جیهانەو ڕۆژی دوایی‌دا ڕێك بخات، خوای گەورە لەڕێگای ڕابەری ئاسمانی‌یەوە ئاڕاستەمان دەکات.

# سروشەکان

لەبەرایی پەیدابوونی بەرەی مرۆڤەوە لەسەر زەوی، خوا پەیامبەری بۆ مرۆڤ ناردووە بۆ ئەوەی سروشی خوا بە بەرەی مرۆڤ ڕابگەیەنن و، بانگەوازی‌یان بکەن بۆ ڕێگای ئاشتی و مل کەچی ڕەها بۆ خودای تاك و ڕاست بنوێنن. ئەمە ئیسلامەکە بانگەوازی ئاشتی خواییو یەکتاپەرستی دەکات. ئەو پەیامە لەڕێگای چەندەها پەیامبەری جیاوازەوە بە نەوە یەك لە دوا یەکەکانی مرۆڤ

ڕاگەیندراوە. هەموو پەیامبەرەکانیش هەزار دروود و سڵاو لەسەر پەیامبەری ئێمەو سەرجەم پەیمامبەرەکانی دی بێت، بانگەوازی کۆمەڵی مرۆڤایەتیان کردووە بۆ یەك ڕێگا. لەبەر ئەوەی هەموو پەیامەکانی پێشوو یاخود سروشە خوایییەکان لەلایەن گەلاني ئەوەی داهاتووشێوێندراون، لە ئاکامدا سروشە پاکەکەی خوا بە ئەفسانە و خەرافات و وەسەنییەت و بت پەرستیو بیری فەلسەفەی نازیرانە پیس کراون. بەم شێوەیە ئاینی خودا لەنێو شالأوی زۆری ئایینە- مرۆڤکردەکاندا- نقووم بوودا وون بوو، ئیسلام هاتووە بۆ ئەوەی مرۆڤ لەدەریای وەسەنییەت و خەرافات و ئەفسانە ڕزگار بکات.

مێژووی ئادەمیزاد بریتییە لە مێژووی ململانێ، مرۆڤ لە نێو ڕۆناکیو تاریکیدا، بەلأم خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی بۆ بەرەی مرۆڤ، ئێمەی مرۆڤ پشت گوێ ناخات:

### ٤- دوا سروشی خوای گەورە:

کاتێـك مـرۆڤ لـــە نێــو قوولآیی‌یــەکانی چەرخــە تاریکەکاندا دەتلایەوە. خوای گەورە دوا پەیامبەری خـۆی کە((محمد)) پێغەمبەرە – دروود و سلآوی خوای گـەورەی لیٚ بێت – نـارد بـۆ ئـەوەی مرۆڤایـەتی لەچەنگی گونـاەو ناکامـەکانی ڕزگـار بکـات. ئــەو سروشــە خوایی‌یــەی بــە پێغەمبـەر– دروود و سـلآوی خـوای گــەورەی لیٚ بێــت – بەخشـراوە، ژێدەرێکـی هەمیشـەیی و لوتکــەی ڕێبــەرێتی ئاسمانی بۆ بەرەی مرۆڤ دەنوێنێت.

# سەنگی مەحەك
# بۆ هەقیقەت

چۆن دەزانیت ئەو سروشەی وەك قورئان وشەی خوای گەورەیە؟!

بەتەرازووی هەڵسەنگاندنی هەقیقەت، هەموو کەسێك دەتوانێت بەئاسانی لە مەسەلەکە حاڵی بێت. ئەو چەند خاڵەی خوارەوە وەلامی ئەوپرسیارەی سەرەوە دەدەنەوە:

## ١- فەرمایشتی ژیریی:

لەبەر ئەوەی خوای گەورە(عەقلّ و هۆش و فیکری) بە ئێمەی مرۆڤ بەخشیوە. ئەوا ئەرك و فەرمانی ئێمەشە کە ئەو عەقلّ و هۆشە بۆ جیاکردنەوەی هەق و ڕاستی لە چەوت و هەلآن بەکاربێنین، هەر بۆیە سروشە ڕاست و

نەشێوێندراوەکەی خـوای گـەورە دەبێـت لـەچوار چێـوەی عەقلْ دابێت و هەروەها خاوەن هۆشە پاکەکان بتوانن لێی تێبگەن.

## ٢- تەواوی سروشەکە:

لەبـەر ئـەوەی خـوای گـەورە لـە هـەموو ناتەواوییـەك دوورەو، لـە هـەموو ڕوویێکـەوە تـەواوە. ئـەوا دەبێـت سروشەکەی تەواو و ورد بێت، هـەروەها لەهەڵەو، لابـردن و، شێواندن و، دوو دەقـی نـاکۆك و دژ بەیـەك دوور بێـت. هەروەها دەبێت لەگێڕانەوەکانیدا ناکۆکی بەدی نەکرێت.

## ٣- بێ ئەفسانەو خەرافات بێ:

سروشـێکی پـاکی خوایـی لـە هـەموو ئەفسـانەو خـەرافاتێك بـەدەرە، کـە لـە سـەروەرێتی خـودای گـەورە یاخود مرۆڤ کەم دەکەنەوە.

### ٤- زانستی بوونی سروشەکە:

هەروەك بەلگەنەویستە کە خوای گەورە داهێنەری هەموو زانستێکە، ئەوا دەبێت سروشەکەشی زانستی بێت و بتوانێت بەرەنگاری زانست بکات لە هەموو زەمانێکدا.

### ٥- پێشبینی دروست:

خوای گەورە هەر خۆی زانەری ڕابردوو وەئێستاو، داهاتووە. لەو ڕوانگەوە قسەی پێشبینی کردنی خوای گەورە لە سروشەکەیدا دەبێت هەروەك چۆن پێشبینی کردووە ئاوا بێتە دی.

### ٦- بێوێنەیی سروشەکە، مرۆڤ نەتوانێت لاسایی بکاتەوە:

سروشی خوای گەورە لە هەلآن بەدەرە، مرۆڤ ناتوانێت لاسایی بکاتەوە. سروشی پاکی خوای گەورە موعجیزەیەکی زیندووە، پەرتوکێکی کراوەیە بەرەنگاری

هەموو مرۆڤایەتی دەبێتەوە بۆ ئەوەی بۆ خۆیـان ببینـن و دانی پێدابنێن.

**خوێنەری ئازیز:**

هیچ گوشارێك ناخرێتە سەر مرۆڤ بـۆ ئـەوەی(ڕاسـتی خودا) وەربگرێت، بەڵام بێگومان شەرمەزاریی‌یە بۆ فیکری مرۆڤ بە دوای ئەوەش نەگەڕێت بۆ ئەوەی بزانێت((راستی هەقیقەت)) چی‌یە! ئاییینی ئیسلام بە مرۆڤ ڕادەگەیـەنێت کـە خـوای گـەورە توانـای بیرکردنـەوەو، ژیـری بـە مـرۆڤ بەخشیوە، هەر بۆیە ئیسـلام چاوەڕێیـە مـرۆڤ بۆ خـۆی بەشـێوەیەکی بابەتیانـەو، ئیزامیانـە لـە شـتەکان ورد بێتـەوە، خـوا چاوەڕێیـە مـرۆڤ بـیر بکاتـەوە، لـەخۆی بپرسێت وبیر بکاتەوە... !

هیـچ کەسێك زۆرت لێناکات کە بڕیارێکی بـە پەلـە بدەیت بۆ ئەوەی هیچ کـامێك لـە فەرمایشتەکانی ئیسـلام وەربگرێت، چونکە ئیسلام خـۆی لـە خـۆی‌دا ئایینێکـە بـە جیهان ڕادەگەیەنێت کە دەبێت مرۆڤ تـەواو سەربەسـتی‌و

ئازادی هەڵبژاردنی پێبدرێت، بە جۆرێك دەمێك مرۆڤ ڕوو بەڕووی((ڕاستی))ش دەبێتەوە زۆری لێناکرێت بۆ ئەوەی باوەڕی پێبێنێت، بەلاّم بەر لەوەی فیکرەیەك لەبارەی ئیسلامەوە پێك بێنێت، لە خۆت بپرسە ئاخۆ ئەوزانیاری‌یەی لەبارەی ئیسلامەوە لەلاتە هێندە توندو تەواوە. لەخۆت بپرسە ئاخۆ ئەو زانیاری‌یەت لەسەرچاوەکانی لایەنی سێیەمی نا- موسڵمانەکانەوە وەرگرتووە، چونکە لەڕاستی‌دا نوسەری ئەو سەرچاوانە خۆیان لەخوایان ویستووە کە تەنیا کلافەیەکی عەشوائی نوسینەکانی ئیسلامی ببینن تا رای بگەیەنن، ئەمەو ئەو سەرچاوانە دەبێت خۆیان بە چاوێکی بابەتی‌یانەو مەنهەجیانە لە ئیسلام ورد ببنەوە هەر بۆ نموونە، ئایا شتێکی دادوەرانەیە کەیەکێك تەنیا بەقسەی کەسانێك فیکرەیەك لەسەرتامی خواردنێکی تایبەت دابرێژێت، لە کاتێکا ئەوکەسانە خۆشیان هێشتا بەشێوەیەکی پێویست تامی ئەو خواردنەیان نەکردبێت؟!

تۆش بەهەمان شێوە دەبێت بۆ خۆت لەسەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە لەئیسلام بگەڕێیت نەك بۆ ئەوەی هەر ئیسلام تام بکەیت، بەڵکو بۆ ئەوەی بە تەواوی هەرسی بکەی، پێش ئەوەی هیچ فیکرەیەك لە بارەیەوە دامەزرێنیت. پەیڕەو کردنی ئەو هاوکێشە فیکریەش ڕێگایەکی فیکری دروستە بۆ ئەوەی لە ئیسلام نزیك ببینەوە.

هەنگاوی دووەم بەرەو جیهانی ئیسلام دەبێت لەخۆتەوە بێت. لەم هەنگاوەدا هەردەم ئیسلام بۆت دووپات دەکاتەوە کە مافەکانت لە ئازادی هەڵبژاردن وئازادی بەکارهێنان تەواو ڕێزی لێدەگیرێت چونکە خوای گەورە توانای فکرو هۆش و عەقڵی بە مرۆڤ بەخشیوە، مرۆڤ لەسەر ئەو بنە مایە ڕەفتار دەکات. هەر بۆیەلەو پێودانگەوە ئەو کارەی مرۆڤێکی هۆشمەند دەیکات ڕێزی لێدەگیرێت. هەموو مرۆڤێك مافی ئەو ئیرادە تاکیە یاخود

کەسـی یەی هەیـەو، هیـچ کەسـێکی تر نـاتوانێت ئـەو ئیرادەیەت لێبسێنێت وە زۆرت لێبکات تەسـلیمی ئـیرادەی خوای گەورە بیت تۆ دەبێ هەر خۆت ئەمە بدۆزیتەوە هەر خۆشـت ئـەو بڕیارە بدەیـت بـەو جۆرە لەوانەیـە گەشـتە فیکری یەکەت بەرەو((ڕاستی)) جیهانی ئیسلام، خۆشـترین گەشت بێت.

**خوێنەری خۆشەویست...**

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ومـن أحسن قولا ممن دعا إلى الله وعمل صالحا وقال إنني مـن المسلمين﴾ فصّلت: ٣٣.

مەڵبـەندی ڕاگـەیاندنی ئیسـلامی (Islamic Propagation Centr ) خـۆی تـەرخان کـردووە بـۆ بڵاوکردنـەوەی پـەیامی ئیسـلام. دەزگاکـەمان چـەندەها کۆڕی فکری ساز دەکا. بەخۆڕایی چەندەها کاری ئـەدەبی و ڕۆشنبیری موسڵمانان لەبارەی ئیسـلام و بـەراوردکردنی

لەگەڵ دینەکانی تر بلاّو دەکاتەوە، هەر بۆیە دەزگاکـەمان پێویسـتی بـە پشـتیوانی تـۆ هەیـە، جـا بـرای موسـڵمان، خوشکی موسڵمان هاوکاری بکە بۆ ئەوەی بتوانـێ لەسـەر چالاکی‌یەکانی بەردەوام بێ.

# پەراوێزەکان

١. د. مۆریس بۆکای، دکتۆرێکی فەڕەنسییە خاوەن چەند کتێبێکە لەوانە((ئینجیل و قورئان و زانست)) وە((لەڕوانگەی زانست و کتێبە پیرۆزەکان: سەرچاوەی مرۆڤ چییە؟)) هەروەها فلیمێك هەیە بەناوی((کتێبی ئایەتەکان)) مۆریس بۆکای سەرپەرشتی ئەو فلیمە دەکات کە لەبارەی قورئانی پیرۆزەوە

٢. ئاماژەیە بۆ ئایەتی((٩٢))ی سورەتی یونس: ﴿فاليوم ننجيك ببدنك لتكون لمن خلفك آية وإن كثيرا من الناس عن آياتنا لغافلون﴾.

٣. لەو نووسینەدا هەردوو وشەی " ئینجیل و تەورات" وەك دوو کتێبی ئاسمانی تەماشا ناکەین، بەڵکو کە ناوی تەورات و ئینجیل دێ مەبەست لەو کتێبە دەسکردانەیە کە قەشەکان نوسیویانە. لە سەردەمێکدا

کۆمەڵە ئینجیلێك هەبوون، بەڵام ئێستا نەصرانی‌یەکان ناوی چوار ئینجیل دێنن ئەویش ئینجیلی لۆقا، مەتی، مورقس و یۆحەننایە هەرچی ئینجیلی بەرنابایە کە لە زۆر شوێن لە ئینجیلە ئاسمانی‌یەکە دەچێ، نەصرانی‌یەکان دانی پێدانانێن.

٤. ئەمەو لە هەمووی گرنگتر خوای گەورە خۆی بەڵێنی پاراستنی قورئانی داوە وەك دەفەرموێ:

﴿إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحافظون﴾ الحجر: ٩.

٥. پێغەمبەر - ﷺ - لە تەمەنی چل ساڵی بۆتە پێغەمبەر. بە واتای لە تەمەنی چل ساڵی وەحی لەخوای گەورەوە بۆ هاتووە ئەو وەحی‌یەش تا دوا ساڵی تەمەنی هەر بەردەوام بووە. کە کۆچیشی کرد تەمەنی ٦٣ ساڵ بوو، کەوابێ وەحی‌یەکە ٢٣ ساڵی خایاندووە نەك نزیکەی بیست ساڵێك وەك نوسەر دەڵێت.

٦. لەنەزەری قورئان، زەوی بە هەموو شتەوە لەماوەی چوار ڕۆژ دروستکراوە، ئاسمانەکانیش بەدوو ڕۆژ

هەروەك خوای گەورە لە قورئان دا دەفەرموێ: ﴿قل أئنكم لتكفرون بالذي خلق الأرض في يومين وتجعلون له أندادا ذلك رب العالمين(٩) وجعل فيها رواسي من فوقها وبارك فيها وقدر فيها أقواتها في أربعة أيام سواء للسائلين(١٠) ثم استوى إلى السماء وهي دخان فقال لها وللأرض ائتيا طوعا أو كرها قالتا أتينا طائعين(١١) فقضاهن سبع سماوات في يومين وأوحى في كل سماء أمرها وزينا السماء الدنيا بمصابيح وحفظا ذلك تقدير العزيز العليم(١٢)﴾ فصّلت: ٩-١٢

٧. هەندێك ماوەی ڕۆژ بە ٢٤ كاتژمێر دادەنێن، بەڵام لەو دوو ئایەتەی خوارەوە مەسەلەكە بەجۆرێكیتر هاتووە: ﴿وإن يوما عند ربك كألف سنة مما تعدون﴾الحج: ٤٧، ﴿في يوم كان مقداره خمسين ألف سنة﴾ المعارج: ٤ .

٨. ئیمامی الرازی لەو بارەیەوە دەفەرموێ: " قورئانی پیرۆز نزیكەی لە ٢١٩ ئایەت باسی ئاسمان و زەوی كردووە. لە ٢٠٣ ئایەتدا باسی ئاسمان وە پیش

زەوی هـاتووە کـەچی تـەنیا لـە ١٦ ئایـەتدا باســـی زەوی وەپێش ئاسمان هاتووە."

٩. تەفسیر کردنی " العالمین " بــە دوو جیـهان لـە ریوایەکی ابن عبــاس وەرگـیراوە ئەگـەرنا زۆربـەی خـاوەن تەفسیرەکان " العـالمین " بـە کۆ وەردەگـرن. هـەندێك " العـالمین " بـە جیـهانی خـاوەن عەقلـەکان دادەنێـــن وەك جیهانی مرۆڤ و مەلائیکە و جن و شەیتان. قرطبیـــــش لـە تەفسـیرەکەیدا " العـالمین " بە هـەموو شـتێکی مـەوجود بێجگە لە خوای گەورە خۆی، تەفسیر دەکات.

١٠. هەندێ موفەسیر وەك أبو السعود دروست کردنی ئاسمان بە دوو ڕۆژ، بە واتای بە " دوو جار– دوو ڕووداو" لە دوو زەمەنی نـەزانراودا لێکدەداتـەوە. بەهـەمان شـێوە دروست کردنی زەویش دەتوانرێ بە چوار زەمەنی نەزانراو لێکبدرێتـــەوە. ئاسمـــــان لـــــە دوو ڕووداوی(رتـــق– تیکچـرژان)و(فتـق – لەیـەك جیابوونـەوە) دروسـت بـووە. زەویش بەهــەمان شـێوە " جـەرمی زەو›، بـەدوو ڕووداوی

رتـق– فتـق بووبـێ، جـاری دووەمیـــش دووبـــارە هـــەمان کـرداری پێشـوو دووبـارە بوبێتـەوە بـۆ ئـەوەی زەویـش بەتەواوی دروست بێت. خوای گەورەش لە هەموو کەسێك زاناترە.

١١. خـــوای گـــەورە دەربـــارەی ڕۆنـــاکی مـــانگ دەفەرموێ: ﴿وجعل القمر فيهن نوراً﴾ نوح: ١٦.

١٢. خـوای گـەورە لەسـێ ئایـەتدا باسـی حاڵـەتی ئەستێرەکانمان بۆ دەکات: ﴿وهو الذی جعل لكم النجـوم لتهتدوا بها في ظلمات البر والبحر﴾الأنعام:٩٧، ﴿وعلامات بالنجم هم يهتدون﴾النحل:١٦، ﴿والسماء والطارق، ومـا أدراك ما الطـــارق، النجـــم الثـــاقب﴾ الطـــارق: ١–٣. بەشێوەیەکی گشتی خوای گەورە لەسێزدە ئایـەتدا باسـی ئەستێرە دەکات کەچی تەنیا لە پێنـج ئایەتدا ئامـاژە بـۆ کوکـب دەکـات ئـەوەش ئەمـــە دەگەیـەنێ کـە لەوانەیـە ژمارەی ئەستێرە لە کوکـب زۆرتربـێ(خـوای گـەورەش لـە هەموو کەسێ زانا ترە).

١٣. ﴿والسماء بنيناها بأيد وإنا لموسعون﴾ الذاريات: ٤٧.

١٤. ڕۆژی پەرستن لەلای جولەکە ڕۆژی شەممە بووە لەلای نەصرانی‌یەکانیش ڕۆژی یەك شەممە، لەلای موسڵمانانیش ڕۆژی جومعە تایبەتمەندی‌یەکی ڕۆحی مەزنی هەیە چونکە هەر هیچ نەبێ لەو ڕۆژەدا موسڵمانان کۆبوونەوەیەکی گەورە دەکەن و بەکۆمەڵ خواپەرستی دەکەن.

١٥. Yahvist یاخود یاهوە وەك خواوەندێك لەلایەن عیبری‌یەکانەوە دەپەرسترا.

١٦. وە بزانم ئەو بەشە نامیلکە کە، مەڵبەندی ڕاگەیاندنی ئیسلامی لە بیرمەنگاهام وەك پاشکۆیەك بۆ وانەکەی د.بۆکای دانابێ‌و بەشێك نەبێ لە وانەکە.

**ژێـــــدەر:**

**Dr. Maurrice Bucaille**
**The Qur'an And Modern Science**
**Birmingham,**

# ناوەرۆك

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |